# شەریعەت

## دین قانوونی ژینە
## فەلسەفەی ئایین
## شیعر و هۆنراوەی بڵاونەکراوە

دانراوی: مامۆستا رەسوول عەتووفی
(سەردەشت)

# شەریعەت

ا- دین قانوونی ژینە

٢- فەلسەفەی دین

٣- شیعر و هۆنراوەی چاپ نەکراوو

لە دیوانەکەیدا

دانراوی:

مامۆستا ڕەسوولی عەتووفی

پێشاسپی بریاجی (سەردەشت)

| | | |
|---|---|---|
| سرشناسه | : | عطوفی، رسول، ۱۳۱۲ - |
| عنوان و نام پدیدآور | : | دینْ قانوونی ژینه/ دانراوی رەسوولی عەتووفی. |
| مشخصات نشر | : | مریوان: امام ربانی، ۱۳۹۲. |
| مشخصات ظاهری | : | ۲۱۰ص. |
| شابک | : | 978-600-6962-03-0 |
| وضعیت فهرست نویسی | : | فیپا |
| یادداشت | : | کردی. |
| موضوع | : | شعر کردی -- قرن ۱۴ |
| رده بندی کنگره | : | ۱۳۹۲ ۴۶ع۷۴۳س/ PIR۳۲۵۶ |
| رده بندی دیویی | : | ۲۱/۹۸فا |
| شماره کتابشناسی ملی | : | ۳۳۵۲۴۳۵ |

ناوی کتیب : شەریعەت

نووسەر : مەلا رەسوولی عەتووفی

ئەوبەتی چاپ : دوهەم ۱۳۹۳

تیراژ : ۱۰۰۰

پیت چنی : ئاشنا «سنە»

ناشر : انتشارات امام ربانی

# دین

# قانونی ژین

بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحِيمِ

## (بەشی یەکەم)

## (پیشەکی)

**(بەناوی یەزدانی بژیودەر وە خاوەن بەزەیی)**

**(ڕەحمەتی خوا دەگەڵ سڵاوی زۆر لەسەر گییانی پاکی پێغەمبەری ئیسلام حەزرەتی (موحەممەد) ﷺ وە پەیڕەوانی بەماوەی بونی دونیا.**

**گەنجە بەڕێزەکان وە کیژە بەشەرەفەکانی گەلی کورد ئەی ڕۆڵە بەشەرەفەکانی نەتەوەی بەرزی کورد زۆر باش بزانن هیچ میللەتێک لەدونیایەدا نییە کە هیچ دینێکی نەبێ بەڵکو هەمو میللەتیک چە ئەوەی ڕابردووە یا ئەوەی ئیستا هەیە وە بگرە ئەوەی داهاتوش مسوگەرە خاوەنی دینێک بۆون وە ئیستاش خاوەنی دینێکن وە لە داهاتوشدا دینێکیان هەر دەبێ چونکە ڕوناکە کۆمەڵە ئینسانێک ناتوانێ بەبێ (ئیدولوژی) واتە دین ژیانی خوۆی بڕێوە بەرێت وە هەمو کۆمەڵ لە ئینسانیک بۆ ڕیک و پێکی وە پارازتنی ئابڕو و شەڕافەتی ئینسانی خۆیی پێویستیەکی زۆری بەدین هەیە وە دەبێ خاوەنی دینک بێ چونکە ئینسان کە هیچ دینکێ نەبێ وەکو پاتاڵ وە ئاژەڵ وە حەیواناتی کێوی و خۆماڵێ دەبی وە دەگەڵ حەیوانات هیچ**

فەرقی نابی واتە ڕێزو شەرافەتو بەرزی ئینسانی لەبەین دەچێی وە عەقڵ و عیلم و زانیاری ئینسان بەهرەیەکی نابێ وە بەفیرۆ دەچێ دەگەل حەیوانات وە درندەی کێویی هیچ فەرقی نابێ واتە رون بۆوە هەمو ئینسانێک مسوگەرە پێویستی بەدین هەیە. واتە بۆمان ڕون بۆوە هەر ئینسانێک ئەگەر بیهەوێ ژیانێکی خۆش و ڕێکو پێکی هەبێ وە شەرافەتو ڕیزو ئیحتیرامی لەناو کۆمەڵدا زۆر بێ وە عەقڵ و عیلمو زانیاری هەبێ وە کەڵکی زۆری لێ وەربگیرێ

- یەکەم - دەبێ (ئیدولوژیەک) دینیکی هەبێ

(دو) دەبێ دینی خۆی زۆر باش بناسی وە بڕوای بەدینی خۆی هەبێ.

(سێ) دەبێ دینی خۆی زۆر باش بەڕێوە بەرێ وە بە گوێرە دینی خۆی ژیانی وەسەرخات واتە ژیانی دەگەڵ دینی بەرابەر بێت.

(چوار) دەبێ بەهەمو توانای خۆی بێوچان تێکۆشی بۆ وەسەرخستنی دین وە پەرەپیدانی دینی خۆیی وە بەرگری لە - لاوەزی وەکەم بونەوەی دینی خۆی بکات.

# (بەشی دوهەم)

## دینی ئیمە ئیسلامە

رۆڵە بەشەرەفەکانی گەلی کورد - ئیمە زۆر باش دەزانین وە زۆر - روناکە ئێمە هەموومان موسوڵمانین دینی ئیمە (ئیسلامە) وە قانونی دینی ئیسلام (قرآن) قورئانە - دینی ئیسلام لەهەمو دینەکانی‌تر باشترە چونکە قانونی دینی ئیسلام (قورئان) لە رۆژێکەوەکە لەلای خووای گەورەوە بۆ پیغەمبەری ئێمە (موحەممەد) ﷺ هاتووە وە بە جامیعەی ئینسان راگەیەندراوە هەتا ئەورو تەنیا نوختەیەکی لێ نەگۆڕاوە - بە تەواوی ماوەتەوە بەڵام دینەکانی‌تر هەمو دەستیان لێ دراوە وە ئاڵوگۆڕیان تێدا کراوە. واتە دینی راستەقینە تەنیا دینی ئیسلامە وە هیچ گومانی تیدا نییە. وەکو یەزدانی مەزن لەقانونی دین (قورئان)دا فەرمویەتی إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ الأسلام. واتە دین لەلای یەزدانی مەزن تەنها دینی أیسلامە. آل‌عمران - آیۀ ١٩

بەو هویە کە یەقین دەزانین دینی ئێمە دێنیکی حەقە وە بەراستی دینی خووایە واجبی سەرشانی ئیمەیە بە تەواوی بیناسین و برۆیان پێی هەبێت وە بۆ سەرکەوتنی و پەرەپێدانی تێکوشین و بەرگری لەوشتانە بکەیین کە پێچەوانەی دینەکەمانن.

# بەشی سێهەم

واجبە لەپێشی هەمو شتێکدا بزانین دین چییە وە بە تەواوی بیناسین.
دین بە تیکڕایی ئەوەیە
(دین قانونێکی ئیجتیماعییە کە خووای گەورە دروستی کردوە ـ وە بە وەسیلەی پێغەمبەران ناردویەتی بۆ کۆمەڵی ئینسان)

واتە دین قانونێکە ـ کە مالی تەواو ـ وە چونیەتی ژیانی شەرافەتمەندانە و، ئارام دور لە ناکۆکیوە چەنگوچەڵەمەی بۆ هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسان دابین دەکا وە بە شێوەیەکی عادلانەی دیاری کردوە بە جۆرێک کە هیچ قانونێکیتر ناتوانی وەکو دین سودو قازانجی بۆ هەمو ئینسانێک هەبێ وە تێکڕایی جامیعەی ئینسان بگرێتەوە لێرەدا ئاشکرا بو دین باشترین قانونی ژیانی ئینسانە. قانونی دینی ئیسلام واتە دینی ئیمە (قورئانە) کە خووای گەورە بۆ پێغەمبەری ئێمە (موحەممەد) ﷺی ناردووە ـ وە حەزرەتی موحەممەد ﷺ درودی خووای لێی بێ لەنێو جامیعەی بەشەردا بەڵاوی کردۆتەوە وە زۆربەی کومەڵێ ئینسان ئەو دینە پیرۆزەیان ناسیوە ـ وە بە ڕاستەقینە بڕوایان پێ هێناوە وە ژیانی خۆیان بە پیی فەرمانی قانونی ئەو دینە پیروزە واتە (قورئان) بەڕێوە بردووە کە سوپاس بۆ خووا ئیستا ئیمە بەچاوی خومان دەبینین ئەو دینە پیروزەی ئیمە دووای هەزار و چووارسەد ساڵ کە

لەتەمەنی ڕابردووە هەر وەکو زەمانی پێغەمبەری مەزن (مـاوەتەوە) واتە قانونی ئەو دینە پیرۆزە (قـورئان) حـەتتا نـوختەیەکـی لێـی نەگۆڕاوە ـ وە کەمو زۆر دەستی لێ نـەدراوە ـ ئـەو (قـورئانە) کـە سەحابەی پێغەمبەری ئیسلام نوسیویانەتەوە دەگەڵ ئەو (قورئانە)ی کە ئێستا لەدەستی ئێمەدایە حەتتا بە نوختەیەکیان جیاوازی نییە وە بە تەواوی وەکو یەکن ئەوە بەڵگەیەکی ڕوناکە لەسەر ئەوەکە یەزدانی مەزن ئەو دین و قانونە (قورئان)ی پارازتووە وە لەمە بەدواش دەی پارێزێت وە ڕۆژ دەگەڵ ڕۆژ ـ پەیڕەوانی دینی ئیسلام زۆرتر بووە ـ وە زۆرتر دەبـێ کـە هـەر ئـەوە ـ بـەڵگەیەکـی ئـاشکرایـە لەسـەر حەقانیەتو ڕاستەقینەی ئەو دینە پیرۆزە).

# بەشی چوارەم

## (مێژوی دینە)

دین دەگەڵ پەیدابونی ئینسان دروست بووە واتە لە ڕۆژێکدا کە یەزدانی مەزن هەوەڵین دایک و بابی ئینسانی بەناوی (ئادەم و حەوا) هێنایە سەر زەوی (قانونی دین) کە لەچەند پەڕێکدا نوسرا بۆوە بەناوی (سوحوف) وە بە وەسیلەی حەزرەتی (جوبرائیل) کە یەکێک لە مەلائیکەتەکانی هەرە بەرزی خوایە وە مەئموری ڕاگەیاندنی (قانونی دین) بە هەمو پێغەمبەرانە ـ بە حەزرەتی ـ ئادەمی ـ ڕاگەیاند ـ وە حەزرەتی ئادەم لەتەواوی ژیانی خۆیدا بەپێی ئەو ـ قانونە دینیەی ـ کە لەناو (سوحوف)دا یەزدانی مەزن بۆیی دیاری کردبو ـ جوڵایەوە و ژیانی پیروزی خوی بردە سەر لە دووای حەزرەتی (ئادەم) هەتا زەمانی حەزرەتی (موسی) دوورود خووایان لەسەر بێت ـ کە هەزاران سەدە ـ دەلە مابەینی (ئادم و موسی) زەمانێ پەڕیوە (قانونی دین) واتە قانونی ژیانی ئینسان ـ ناوی (سوحوف) بووە ـ وە هەروەها لەو ماوە زۆرەدا ـ هەزاران جار کۆمەڵێ ئینسان زوربەیان ڕویان لە (سوحوف) وەرگێڕاوە ـ وە لەبەینیان بردوە وە کافر بوون ـ کە یەزدانی مەزن هەمو جارەکان ـ ئینسانێکی پاک و خاوێنی لەناو کومەڵەکە مایەسیە خاوێنەکان

هەڵبژارتووەو کردویەتە پێغەمبەر ـ وە سەر لەنوێ لەسەر زوبانی وی‌و قەومەکەی بە وەسیلەی حەزرەتی (جوبرائیل) (سوحوفی) بۆ ناردۆتەوە ـ وە ئەو پێغەمبەرەش لەناو کۆمەڵێ کاتی خۆیدا بڵاوی کردۆتەوە ـ وە زۆربەی کۆمەڵێ ئینسان ـ بڕوایان پێ کردووە ـ وە پەیرەویان لێ کردووە ـ واتە هەزاران پێغەمبەر هاتون‌و (قانونی دین) قانونی ژیانی ئینسانیان نووێ کردۆتەوە بەڵام کاتی حەزرەتی (موسی) دورودی خوایی لی بێت بوبە پێغەمبەر ـ قانونی دینی بەناوی (تەورات) بۆی هاتە خوارێ واتە ـ یەزدانی مەزن ـ ناوی (سوحوفی) بەناوی (تەورات) گورپەوە ـ وە قانونی دینی ـ بەناوی (تەورات) بۆ حەزرەتی (موسی)علیه‌السلام ناردووە لەدووای حەزرەتی (موسی)علیه‌السلام هەتا زەمانی حەزرەتی (عیسی)علیه‌السلام (قانونی دین) واتە قانونی ژیانی ئینسان ناوی (تەورات) بووە ـ وە هەروەها ـ لەمابەینی حەزرەتی (موسی)علیه‌السلام و حەزرەتی عیسیعلیه‌السلام هەزاران ـ سەدە لە زەمان تێ پەڕیوە ـ وە زۆر جاریش (قانونی دین) لەبەین چووە ـ کە یەزدانی مەزن بە وەسیلەی پێغەمبەران زیندوی کردۆتەوە پیویستە ئەوەش زۆر باش بزانین کە لە مابەینی حەزرەتی (موسی) وە حەزرەتی (عیسی)داعلیه‌السلام لەو زنجیرە پیغەمبەرانەی کە پەی‌رەویان لە(تەورات) کردووە پێغەمبەرێک هەبوە بەناوی حەزرەتی (داود) دورودی خووای لەسەر بێت کە ئەو پێغەمبەرە سەرّای ئەوە کە (قانونی دینی) لەناو کۆمەڵێ ئینساندا بەناوی (تەورات) زیندو کردۆتەوە ـ یەزدانی مەزن کتیبیکی دیکەشی بەناوی (زەبور) بۆ ناردووە کە ئەو کتیبە واتە (زەبور) سەدو پەنجا سورەت بووە ـ وە بەسێ ـ بەش ـ دابەش کراوە ـ بەشی یەکەمی

چۆنیەتی وە ڕوداوەکانی کۆمەڵانی ڕابردو بوە ـ بەشی ـ دوهەمی چۆنیەتی وە ڕوداوەکانی کۆمەڵانی ـ داهاتو ـ تایبەت چۆنیەتی کردەوەکانی (بخت‌نّصر) بووە کە یەزدانی مەزن بو حەزرەتی (داودی) ڕون کردونەوە واتە ئەو دو بەشانە تەنیا بۆ ئاگاداری وەکو مێژو لە لایەین یەزدانی مەزن هاتونە خواری ـ بەشی سێ هەمیشی ـ ئاموژگاری وە هەڵنانی کۆمەڵێ ئینسان لەسەر پەیڕەوی لە قانونی دین بەناوی (تەوڕات) بووە.

بەکورتی بڵێین (زبور) (قانونی دین) واتە قانونی ژیانی ئیسان نەبووە بەڵکو تایبەتی بە حەزرەتی (داود) بووە چونکە حەزرەتی (داود)یش قانونی دینی بەناوی (تەوڕات) زیندو کردوتەوە هەروەها زنجیرە پێغەمبەرێکیش کە لە دووای حەزرەتی (داود) هاتون هەتا زەمانی حەزرەتی (یحیی) درود خوای لەسەر بێت.

بەڵام دووای مردنی ئاخرین پێغەمبەرێ ـ لەو ـ زنجیرە پێغەمبەرانەی کە تەوڕاتیان بۆ هاتبۆ ـ خوارێ لەلایەن ـ یەزدانی مەزنەوە ـ بەناوی ـ حەزرەتی (یحیی) کە ئاخرین پێغەمبەری (بن أسرائیلیان) بووە ـ چەند نەفەرێک لەوانە کەهەر لەبنچینەوە بڕوایان بە (تەوڕات) واتە قانونی (خوای بێ‌شەریک) نەبووە ـ لە هەڵکەوتێکدا تەواوی تەوڕاتە نوسراوەکانیان کۆکردونەوە ـ وە هەمویان سوتاندن ـ دووای بەپێی ـ ئاوات‌و ئارەزۆری خۆیان ـ چەند نوسراوەیەکیان دورووست کردوە بەناوی تەوڕاتی ڕاستەقینە ـ واتە قانونی دینی لەناو کۆمەڵیاندا بڵاو کردۆتەوە بەرە بەرە کۆمەلیان لەدین وەرگێڕا بۆ ماوەی چەند ساڵێک تەوڕاتی ڕاستەقینە واتە قانونی خوا بەتەواوی لەبەین چووە هەمویان کافر بون کە ئێستاش

سێ جۆر لەو تەوراتە دروست کراوا نەماونەوە کە هەمویان بەپێچەوانەی یەکترین هەر بەو هۆیە بو کە ئیستا قەومی (جولەکە) خاوەنی سی دینی لێک جودایە بەڵام چونکە میللەتی (جولەکە) دینی بەلاوە گرنگ نییە ئیختیلافی دین نەبوتە هۆی تێکدانی یەکیەتی وان ـ کاتی حەزرەتی (عیسی) بوبە پێغەمبەر قانونی دینی واتە قانونی ژیانی ئینسانی بەناوی (ئینجیل) بۆی هاتە خوارێ واتە یەزدانی مەزن ناوی (تەوراتی) بە (ئینجیل) گۆریەوەو قانونی دینی بە وسیلەیی (جوبرائیل) بەناوی (ئینجیل) بۆ حەزرەتی (عیسی) ناردووە ـ وە حەزرەتی عیسی ئەو قانونە پیروزەی لەناو کۆمەلێ ئینساندا بەڵاو کردەوە بەڵام زۆری پی نەچو کە پاشاو زۆردارەکانی ئەو کاتە بە قەسدی کوشتن هێرشیان کردە سەر حەزرەتی عیسی کە خوا بە لوتفی خۆی بە وەسیلەی حەزرەتی جوبرائیل حەزرەتی عیسیی رەزگار کردوە بردی بو حاسمانێ. پێویستە ئەوەش بزانین ئەو موضوعە بیرو بڕوای زۆری لەسەرەو هێندیک لایان وایە حەزرەتی عیسی شەهید کراوە. لەکتێبی تأریخ‌الأنبیاءدا لەموضوع حەزرەت عیسیدا شەهادەتەکەشی بە نالەباری نوسیوە. دەگەڵ ئەوە یەزدانی مەزن لەسورەتی نیساء آیەتی ١٥٧دا فەرمویەتی: (وَ مٰا قَتَلُوهُ وَ مٰا صَلَبُوهُ وَلٰكِنْ شُبِّهَ لَهُمْ) واتە ئەو کافرانە حەزرەتی عیسی علیه السلام یان نەکوشتووەو هەڵیان ناوەسیوە ـ بەڵکو ـ لێیان گوڕاوە بەیەکی وەکو ئەوی واتە ئەو ڕیواتە کە چۆتە حاسمان دروستەو یەقینە وە ئەو پاشاو زۆردارانە پیاوێکیان لەوێنەی حەزرەتی عیسی دەست کەوت کە پێیان وابو حەزرەتی عیسییە کوشتییان وە هەمو ئینجیلەکانیان کۆکردنەوە هەمویان سوتاندن واتە قانونی خوایان بە

تەواوی لەبەین بردو وە خۆیان بەپێی ئاوات وە ئارەزۆری خۆیان چەند نوسراوەیەکیان دروست کردوە بەناوی ئینجیل واتە قـانونی دین و لەناو کۆمەڵیاندا بەڵاو کـردنەوە کـەم کـەمە خـەڵکیان لەدیـن وەرگێراوە زوربەیان کافر بون کە ئیستاش چەند جور لەو ئـینجیلە دروست کراوانە ماونەوە هەر بەو هویە بو کە ئـیستا عـیسەویەکـان خاوەنی چەند (ئینجیل) واتە دینی لێک جـودان کـە هـەمویان بـە پێچەوانەی یەکترین بەڵام عیسەویەکانیش هەر وەکو موساییەکـان دینیان هێندە بەلاوە گرنیگ نییە کە هوی ناکوکیٚ نیوان بـێت بـەڵام هێندێکی زۆر کەم کە زۆر باش ئاگادار بون لەوە کـە ئـەو ئـینجیلە ڕاستەقینەیی کە خووا ناردویەتی لەبەین چووە وە ئەو ئینجیلانەی کە لەناو کۆمەڵدان سازکراوی دەستی دوژمنانی خوان لەسەر باوەڕی پیشۆی خۆیان مانەوە بەڵام چـونکە قـانونی خـوایـان لە دەستدا نەمابو ئەو زنجیرە ئینسانە هەر توانیان دو + سێ پشت هـیندیک لەقانونی خووا بەرێوە بەرن وە لەپاش چەند پشت ئەو تۆزە قانونەش لەبیر چووە بەڵکو دینی ئەوان ئەوە بو کە (خوایان بەحەق دەناسی وە هیچ دینیکی تازەیان قەبوڵ نەبو) ئەوانە پێیان دەگوتن (حەنیفییە) ئەو زنجیرە ئینسانە چەندین سەدە بەو جـۆرە هـاتنە خـوارێ کـە بەرەبابی پێغەمبەری ئێمە حەزرەتی (موحەممەد) لەوانە بو.

کاتی پیغەمبەری ئێمە حەزرەتی (موحەممەد) درودی خووایی لەسەروی و لەسەر هەمو پیغەمبەران بێ لەتەمەنی چلساڵیدا بـو بـە پیغەمبەر قانونی دینی بەناوی (قورئان) بۆ هاتە خوارێ واتە یەزدانی مەزن ناوی (ئـینجیلی) بـە (قـورئان) گـۆڕیەوە ـ وە بـەوەسیلەی حەزرەتی (جوبرائیل) قانونی دینی واتە قانونی ژیـانی ئـینسانی

بــەناوی (قــورئان) بـۆ حــەزرەتی (مــوحەممەد)ﷺ نــاردووە وە (قورئان) لەماوەی ٢٣ بیستو سێ ساڵ کە ماوەی پیغەمبەرایــەتی حەزرەتی (موحەممەد)ﷺ بووە لەلاین یەزدانی مــەزنەوە هــاتۆتە خوارێ وە تەواو کراوە کە حەزرەتی (مــوحەممەد)ﷺ لەو مــاوەدا بەهەمو توانای خۆی دەگەڵ ئەوە کە هەزاران رەنج و ئازاری کێشاوە وردە ـ وردە قورئانی بەناو کومەلێ ئیساندا بەلاو کردەوە کە زۆربەی ئینسانە بەشەرەفەکان بروایان پێ کردوە پەیرەویان لیی کرد ـ وەکو خۆر بەتیشکی پیرۆزی خۆی شەوی تاریکی ـکوفری ـ لەبەین بردو دونیای رۆناک کردەوە کە سوپاس بۆ خــوا هــەتا ئــەورۆ کــە ئــێمە بەچاوی خومان دەبینین کە ئەو دینە پیرۆزە (بێئەوەی دەستی تی وەربدرێ یا چوکترین ئالۆگۆری تێدا بکرێ) هــەر وەکــو خــۆیی ماوەتەوە ـ وە رۆژ دەگەڵ رۆژ زیاتر بووە ـ وە زیاتر دەبێ + ئەگەر بەوردی لەمێژوی دین بکۆڵینەوە بە بــیرێکی وشــیارانــە ســەرنجی بدەینێی ئەو پرسیارانەی خوارێمان بۆ دێنە پێش.

# بەشی پێنجەم

## (لێ کۆڵینەوەی دینە)

## (پرسیاری یەکەم)

بۆچی قانونی دینی خوا لە حەزرەتی (ئادەمە)وە هەتا زەمانی حەزرەتی (موحەممەد)ﷺ پێغەمبەری ئیسلام هێندە گۆڕاوەو لەبەین چووە و زیندو کراوەتەوە بەڵام دینی ئیسلام دەستی لێی نەدراوەو هەروەکو خویی ماوەتەوە

## (پرسیاری دووەم)

## بۆچی قانونی دین

واتە قانونی ژیانی ئینسان هەر دەبێ یەزدانی مەزن دایبنێ وە ناکرێ ئینسانێکی زاناو هەڵکەوتو دایبنێ.

## (پرسیاری سێهەم)

ئەگەر قانونی دین ـ قانونی ژیانی ئینسانە وە قازانج و بەرهەمی خۆشی و چاکەی هەر بۆ ئینسان دەگەڕێتەوە خۆ هەمو ئینسان عەبدی خوان و خوایە لۆتفی خویی وەدی هێناون و دورستی کردون، بۆچی بۆ هێندیکان خۆشی هەمیشەیی و دووانە هاتو

(بەهەشتی)ی بۆ داناون ـ وە بۆ هێندکان ئازارو عەزابی هەمیشەی و دووانە هاتو (جەهننەمی)ی بۆ داناون خۆ دەیتوانی هەموان وەکێک وەدی بێنێ و خۆشی دائیمیان بداتی.

## (وەڵامی پرسیاری یەکەم)

قانونی دین واتە قانونێ کە خوا بۆ ژیانی ئینسانی داناوە قانونێکە بۆ ڕیک و پێکی و ئارامی و ئەمینی و بەختەوەری ژیانی ئینسانە وە بۆ هەر فەردێک لە ئەفرادی ئینسان مافی تەواوی بەرابەری و برایەتی دیاری کردوە دوژمنی زوڵمی ئینسانێک لە ئینسانیکە ـ دژمنی ئازاری ئینسانێک لە ئینسانیکە دوژمنی ئەوەیە کە ئینسانێک چاو بیرێتە ماڵو ناموسی ئینسانێکیتر دوژمنی فەسادی ئەخلاق و فەسادی کردەوەیە بەکورتی هیچ ئینسانێک لە ئینسانێک زیاتر نییە مەگەر بە تەقوا ـ واتە ئەوەی کە تەقوای بۆ خوا زۆرترە وە خزمەتی بو عەبدانی خوا زیاترە لەلای خوا ڕێزی پترە ـ ئەوە کەدین مافی هەمو کەسی دیاری کردوە ـ خوا لە (قورئان)دا فەرمویەتی: (وَ لاٰ تَنْسَ نَصیبَكَ مِنَ الدُّنْیا) سورة القصص آیة ٧٧

خوا فەرمویەتی ئەی موحەممەد لەبیر خۆت مەبەوە بەشی خۆت لەدونیایەدا + مەبەست لێرەدا هەمو ئینسانیکە لەبیرت نەچێ بەشی خۆت لەدونیایەدا بەڵگەیەکی ڕونە کە هەمو ئینسانێک بەشی هەیە واتە دین بەشی هەمو ئینسانێکی دیاری کردون ـ بەش واتە ژیان لە چوارشت پێکهاتووە ـ ئیحترام ـ ناموس ـ ئەمینی ـ ماڵ واتە بژیو ـ واتە دین حەقی ژیانی داوەتە بەهەمو کەس وەکو یەک + لە ئایەتێکیتردا خووا فەرمویەتی (یا أَیُّها النّاسُ إِنَّا خَلَقْناکم مِنْ

ذَكَرٍ وَ أُنْثىٰ وَ جَعَلْناكُمْ شُعوباً وَ قَبائِلاً لِتَعارِفوا ـ إنَّ اَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقيٰكُمْ) (اِنَّ اللهَ عَلَيْهم وَ خَبِرٌ) (الحجرات آية ١٣)

واته ئەی ئەو کۆمەڵانەی ناو براون بە ئینسان یەقین بزانن ئێوەم لەنێرو مێیەک (واتە ئادەم و حەووا) دروست کردووە ـ وە ئێوەم بە چەند نەتەوە وە هەر نەتەوەی بەچەند هۆزو تیرە ـ دابەش کردوون ـ بە گوێرەی فەرمودەی زانایانی (قورئان) و تەفسیر ـ فەلسەفەو حیکمەت لەوەدا کە یەزدانی مەزن ئینسانی بەڕەنگ و شێوەو قەوم و هۆزی جۆراو جۆر وەدیهێناوە بۆ ئەوەیە دەگەڵ لێک دوری دیمەن و هۆزو تیرە دەبێ یەکتر بناسن چونکە عیللەتی وەدی هێنانیو جیاوازیەکەی کردە ناساندنی یەکتری و فەرموی (لِتَعارَفُوا) و ناسینی تەواویش ئەوەیە کەسێک کەسێکی ناسی دەزانی ماڵی و مڵکی چەندە ـ پلەو پایەی چەندە ـ ڕێزو ئیحترامی چەندە وژن و منداڵی چەندەن جا ئەگەر چوار تایبەتیەکانی ـ ناسی دەبێ بیانپارێزیو خەیانەتیان پێ نەکات جا یەقین بزانن یەزدانی مەزن زاناو ئاگادارە و هەمو شتێک دەزانی.

مەبەست لێرەدا ئەوەیە ـ ئیحترام و ناموس و ماڵ و گیبانی یەکتر بپارێزن واتە یەکتر مەکوژنو ئیحترامی یەکتر مەشکێنن وە سوکایەتی بەناموسی یەکتر مەکەن وە یەکتر ئازارو ئەزیەت مەکەن وە ماڵی یەکتر مەخۆن ـ لێرەدا ڕون بۆوە کە قانونی دین مافی ژیبانی هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسانی وەکۆ یەک داناوە ـ وە هەمویان بەرابەرن ـ لە دواییدا خووا فەرموی (گەروەتر لەئێوە ـ بەدینتر لەئیوەیە + واتە هەرکەسێ بەدینتر بێ ڕێزی لایی خووا زیباترە) لێرەدا ئەوەمان بۆ ڕون بۆوە ئەگەر کەسێک خەیانەت بکا بە ژیبانی کەسێکیتر واتە

بێ ئیحترامی پێ بکات یا چاو ببڕیتە ناموسی یا ئازاری بدات یا ماڵێ بخوات بە زاڵم حیسابکراوە ـ وە قانونی دین واتە (قورئان) لەبارەی زاڵمدا فەرمویەتی (وَ سَيَعْلَمُ الَّذِين ظَلَمُوا أَيَّ مُنْقَلَبٍ يَنْقَلِبُونْ) سورة الشعراء آية ٢٢٧.

یەزدانی مەزن فەرمویەتی لەوە بەدواوە دەزانن وە بە چاوی خۆیان دەبینن ئەوانەی کە زوڵم دەکەن کە چۆن سەرەو خون دەبن واتە سەرەو خۆن دەکەونە عەزابی (جەهەننەمەوە) خوای گەورە دوبارەی کردۆتەوە فەرموی (يَنْقَلِبُونْ) بەلێ سەرەو خۆن دەکەونە عەزابەوە ـ ئەو دوبارە کردنەوە بلگەیە لەسەر شیددەتی عەزابی خوواو توندتر عەزابی بۆ زاڵم ـ ئەوە نمونەیەکی چوکە لە بولە قانونی دین (قورئان) واتە قانونی ژیانی ئینسان کە زۆر بەکورتی بەیان کرا ـ جا ئەگەر قانونی دین لەناو کۆمەلێ ئینسان بە تەواوی پەیرەوی لێی بکرێ ئیتر شوێنێک بۆ زاڵم و زۆردارو فەساد نامێنێتەوە هیچ ناکۆکیەک نایەتە نیوان (پرسییار) بەڕێوەبەری ئەو دینە پیرۆزە کێیە؟ ـ وەڵام ـ سەرەتا ئەرکی سەرشانی پێغەمبەرانە ـ دوایی ئەرکی سەرشانی زانایانی دینیە کە قانونی دین بەڕێوە بەرن چونکە (عولەمای دینی) واتە مامەستایانی ئاینی ئەگەر بەڕاستی ئەرکی سەرشانی خۆیان بەڕێوە بەرن لەجێی پێغەمبەرانن واتە میراتگری وانن + هەر وەکو ڕۆژ ئاشکرایە قانونی دینی خوا بە پێچەوانەی ئاوات و ئارەزوێی هەمو زاڵم و زۆردارو فەسادێکە هەرچی زاڵم و زۆردارو فەسادکارە قانونی دینی خووا بە سەددێکی پولاێی لەپێش ئاوات و ئارەزۆی خۆیانی دەزانن وە بەهەمو + تووانای خۆیان هەولێ بۆ دەدن کە ئەو سەددە بشکێنن وە بە تەواوی لەبەینی بەرن جا

لەسەرەتای ئیسلامەوە هەتا زەمانی حەزرەتی ئآدەم لە مابەینی هەمو پێغەمبەرەکاندا واتە لە مابەینی ئەو پێغەمەرە هەتا پـیغەمبەرێکی لە شوێنی هاتووە (هەر بەو شێوە لە ئادەم هەتا ئیسلام) زاڵم و زۆرداری وا هەڵکەوتون (تا ئەو جێگایە هێندیکیان داوای خوایەتیان کردوە) کە توانیویانە لە هەڵکەوت و دەرفەتدا پێغەمبەریان زانا ڕاستەقینە ئاینیەکانیان کوشتون. وە هێندێک بێ مێچک و پوڵ پەرست (کە نوری دین لەدلێ واندا شوێنیکی نەبووە) لیباسی ئاینیان کـردوتە بـەر وە بەوسیلەی ئەوانە قانونی دینی خوایان لەبەین بردووە ـ وە بە ئاوات و ئارەزۆی خویان. قـانونێکیان دروست کـردوەو بـناوی دیـن بـڵاو کراوەتەوە (وردە وردە) کومەڵیان لەدین وەرگێڕاوە هەتا زۆربـەیان کافر بوون بەڵام چونکە نـەیانتوانـیوە قـانونێکی وا دابـنین کـە بـە قازانجی هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسان بێ پاش ماوەیەکی کەم زوربەی کومەڵێ ئینسان کەوتۆتە ژێر باری قورسی ئازارو کوشت و کوشتارو تاڵان و بڕۆ ـ وە هەمو جۆرە فەسادێک (جا یەزدانی مەزن) بەزەیی بە عەبدانی خوییدا هاتووە بە وەسیلەی پـیغەمبەران سـەر لەنۆی دینی زیندوکردوتەوە هەر بەو هۆیە بو (یەزدانی مەزن) سەدو بیستو چوار هەزار پیغەمبەری لە کۆمەڵی ئینسان هەڵبژارتـووە ـ وە دینی پێ زیندوو کردونەوە ـ ئەوە بو هۆی گۆڕان و لەبـەین چـون و زیندوبونەوەی (قانونی دین) لە ئآدەم تا خاتەم.

# بەشی شەشەم دەوری خاتەم

کـــاتێ قـــانونی دیـــن بـــەناوی (قـــورئان) بـــۆ حـــەزرەتی (موحەممەد)ﷺ درودی خوای لەسەر بێ هاتە خوارێ یـەزدانـی مەزن بە وەسیلەی پێغەمبەری ئیسلام بە کۆمەڵی ئینسانی ڕاگەیاندو فەرموی (إِنَّ الدِّينَ عِنْدَ اللهِ اَلْاِسْلاٰمُ) آل‌عمران آیۀ ١٢. بـە حـەقیقەت دین لەلای خوا تەنیا دینی ئیسلامە واتە بەڕاستی وە بە حـەقیقەت قانونی دینی ئـیسلام (قـانونی ژیـانی ئـینسان) (قـورئان).لەلای (خوا)وە بۆ کومەڵێ ئینسان دیاری کراوە ـ وە تەنیا قانونێکە ـ کـە دەتوانی مافی تـەواوی ژیـانی کـۆمەڵێ ئـینسان دابـین بکـات وە قانونێکی حـەققەو ڕاسـتەقینەو هـیچ گـومانی تـێدا نـییە وە بـاقی دینەکاتی‌تر هەمویان بەتاڵن وە شوێنی پەیڕەوی نین چونکە وەکو لە پێشەوە بەیانکرا دینەکاتی‌تر (لە ئادەم تا ئـیسلام) لەبـەین چـون‌و گـــۆڕاون وە ئـــەو دیـــنە (غـەیرە ئـیسلامیانەی) کـە ئـیستا هـەن دروستکراوی دوژمنانی (یەزدانـی بـەڕێزن) و بـەتاڵن جـا ئـەوە بەڵگەیەکی زۆر ڕوناکە لەسەر حەقانیەت وە ڕاستی و پاکی دیـنی پیرۆزی ئیسلام وە بەتاڵێ باقی دینەکانی‌تر + بەڵام ئەوە کە دیـنی ئیسلام نەگۆڕاوە چـونکە لەزەمـانی ژیـانی پـیروزی پـیغەمبەری ئیسلام هەتا دووای (خولەفای ئیسلامی) قانونی پیرۆزی ئـیسلام (قورئان) لەناو زوربەی کۆمەڵێ ئـینساندا خـۆیی حـاکـم بـووەو

دوژمنانی (قورئان) نەیانتوانیوە چاوی لەبەر هـەڵێنن + کـاتی کـە زنجیرەی (خولەفای ئیسلامی) دووایی پێهات وە قودرەت لەنیو جامیعەی ئیسلامیدا کەوتە بەردەستی پاشاو رۆئەسای جـمهوری ئەوانیش هەر چەند ـ زوربەیان ـ زیاتر کردە وە یان بە پێچەوانـەی قانونی دین (قورئان) بووە بەڵام بـیرو بـاوەڕیان بـە قـانونی دیـن (قورئان) پتەو بووە و رێزیان لێ گرتووە و پشتیوانیان لێ کردووە ـ وە ئەگەر لەنێو ـ ئەوانەدا هێندێک نەیارو دوژمنی (دین) ـ هەڵکەوتون بەهۆی ئەوەکە زانا ڕاستەقینە ئاینیەکانی دینی پیرۆزی ئیسلام هێندە بە جەرگو بەهێزو لەخۆ بوردو بوون بـۆ پـارازتـنی قـانونی دیـنی خویان (قورئان) نەیارەکان ـ نەیانتوانیوە پچوکتر زیيانێک بە قانونی دینی پیرۆزی ئیسلام (قـورئان) بگـەیەنن وە هـەروەکـو زەمـانی پیغەمبەر ماوەتەوە بەڵکو سوپاس بۆ (خوا) زیاتر تەرەقی کردوە وە پەرەی ئەستاندووە ـ ئەگەر لەزەمانی حەزرەتی (موحەممەد) درودی خوای لێ بێ ـ پەیڕەوانی ئایینی پیرۆزی ئیسلام ژمارەی لەچەند میلیون زییاتر نەبوە.

ئـیستا پـاش تـیپەڕینی هـەزارو چـوارسـەد + سـاڵ ژمـارەی پەیڕەوانی ئەو دینە پیروزە گەیوەتە میلیاردێک کە بە ڕاستی ئـەوە شوێنی شانازی جامیعەی ئیسلامە تـاییەت ئـەوە زۆرتـر شـوێنی شانازی جامیعەی ئیسلامە کە یەزدانی مەزن لەقانونی ژیانی ئینسان (قورئان)دا بەڵێن ئاگاداری وە پارازتنی (قورئانی) قـانونی دیـنی پیروزی ئیسلام) واتە قانونی ژیانی ئینسان داوە ـ کە ئەو بەڵێنە بۆ کتیبە حاسمانیەکانی پیش (قورئان) نەهاتووە کە فەرمویەتی (نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَ إِنَّا لَهُ لَحَافِظُونْ) الحجرات ـ آیة ٩. واتـە ـ ئـێمە

قورئانمان ـ ناردۆته خوواریّ (بو قانونی ژیانی ئینسان) و هەر ئێمە ئاگاداری دەکەین وە دەیپارێزین لە دوژمنان و نەیارەکانی ـ ئەو بەڵێنە جیگای دڵنیاییەو یەقینە بە پێی تەمەنی دونیا هەر دەمێنێتەوەو تەرقی دەکاتو هیچ نەیارو دوژمنێک دەسەلاّتی تیکدانی نابی.

# بەشی حەوتەم

وەڵامی پرسیاری دوهەم کە بۆچی قانونی دین واتە (قانونی ژیانی ئینسان) هەر دەبی یەزدانی مەزن داینێ و ناکرێ ئینسانێکی زاناو هەڵکەوتو ـ داینێ؟
ئەگەر بەوردی سەرنجی وەڵامی یەکەم بدرێ وە بە تەواوی بیری لێوە کەین (دوشتمان) بۆ ڕون دەبێتەوە:
(یەکەم) ئەوەیە کە (قانونی دینی خوا) واتە قانونێک کە خوا بۆ ژیانی ئینسانی داناوە (هەرگیزاو هەرگیز) نافەوتێ.
(دوهەم) هیچ ئینسانێکی زاناو هەڵکەوتو ناتوانێ (قانونی دین) قانونی ژیانی ئینسان دابنێ بە شێوەیەک ـ کە مافی تەواوی ژیانی هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسان کە بڕیتیە لە (ئیحترام و ناموس و ماڵ و ئەمینی گیانی لەهەمو زەمانێک)دا دیاری بکات وە بێ پارێزێت چونکە لەپێشەوە گوتمان (وە هەمو کەسێکی موسوڵمانیش ئەوەی بیستووە) سەدو بیست و چوار هەزار (پێغەمبەر) هاتونە سەر دونییایە واتە چەند جار دین لەبەین چووەو زیندو کراوەتەوە (لە ئادەم ـ تا خاتەم) و گەورەترین زاناو پسپۆڕی زەمان (قانونی دینی) یان لەبەین بردوەو پاش ماوەیەک (خوا قانونی دینی) زیندو کردۆتەوەو ئیستاش هەر زیندویەو وە هەتا دونیایش هەیە هەر زیندو دەبێ.

لێرەدا ڕون دەبێتەوە کە (قانونی دین) قانونیک کە خوا بۆ ژییانی ئینسانی دانا وە حەتمی نافەوتێ وە هەروەها ئەو زاناو پسپۆڕانە کە لەهەمو جارەکاندا توانیویانە (قانونی دین) لەبەین بەرن (لە ئادەم تا ئیسلام) هێندە زاناو تێگەیشتوو هەڵکەوتو بوون کە توانیویانە بەهێزی عەقڵ و زانین دەسەڵاتی زوربەی زەوی بگرنە دەست خۆکە هێندیکیان ـ هێندە لەخۆ دەرچوون ـ داوای (خووایەتیان کردوە) جا بەو هەمو عەقڵ و زانیاریەوە دوای ئەوە (قانونی دینی خوا) یان تێکداوە بە هەمو توانای خۆیان قانونێکیان بو ژیانی ئینسان دروست کردوە بەڵام چونکە بە قازانجی هەمو کۆمەڵێ ئینسانە بوە بەڵکو هیندیکیان کردونە (عەبد) و (جاریە) و بەپێی ئاوات و ئارەزویی خویان کۆمەڵی هەژارو فەقیریان چەساندۆتەوە پاش ماوەیەکی کەم زوربەی کۆمەڵێ ئینسان کەوتۆتە گێژی بەڵای بێ دەوای دیلی و هەژاری و (بەردەگی) وە بەتیکڕایی کەوتونە ئاگری بێ ئەمانی کوفرو فەساد وە ـ دوایی (خوا) غەزەبی بەسەردا باراندون هەمویان یان زوربەیانی (مەحو) کردوتەوە لەپاشان بە وەسیلەی پێغەمبەرێک (قانونی دینی) ـ قانونی ژیانی بۆ کۆمەڵێ ئینسان ناردوە ـ و (دینی) زیندو کردۆتەوە ـ لێرەدا ـ دەرکەوت کە هیچ ئینسانێک ناتوانێ (قانونی دین) کە بە قازانجی هەمو ئینسانێک بێ دابنێ ـ هۆیی ئەوەش زۆر ڕوناکە چونکە هیچ ئینسانێک ناگاتە (حەددی تەکامولْ) ناگاتە پلەی تەواو ـ وە هەر ئینسانێک بیگری ناتەواوە (نەقسی هەیە) کورت و کەمی ئینسان یەکجار زۆرە کە ناتوانێ بەرگریان لێ بکات بەڵام گەورەتر لەهەمویان مردنە کە زۆر ـ ڕوناکە هیچ ئینسانێک ناتوانی بەرگری لەمردنی خۆیی بکات چۆن

دەتوانێ قانونێک بۆ ژیانی ئینسان دابنێت کە لەهەمو زەمانێکدا بەسودو قازانجی هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسان بێت.

بەڕاستی هەرکەس بیری وا بکات هەڵەیەکی گەورەیە وە تاوانێکی نەبەخشەراوە لەلای (خوای گەورە).

# بەشی هەشتەم
## (وەلآمی پرسیاری سێهەم)

وەلآمی ئەو پرسیارە ئەگەر توزێکی بیری لێ وەکەین زۆر ئاسان و ڕوناکە وە هەر لەچۆنیەتی ژییانی خۆمانداوە دەر دەکەوێت ـ بۆ وێنە باوکێک چەند کوڕی هەیە ـ کامەیان لە هەموان ـ باشتر بەقسەی بکات وە پەیرەوی لێ بکات یەقینە لەوانی تری خۆشتر دەوێت وە چاکەی زییاتر لەگەڵ دەکات وە زۆریش هەڵکەوتووەکە باوک کوڕی خەراپی خۆی دەرکردووە تەنانەت لەماڵ و سامانی خۆی بێبەشی کـردوە دەگەڵ ئەوە ئەو باوکە ئەو کوڕەی خۆی دروست نەکردوە و بەڵکو ـ واسیتەی دروستکردنی بووە ـ گەورەی نەکردووە واسیتەی گەورە بونی بووە ـ ژییانی نەداوەتی بەڵکو واسیتەی ژییانی بووە ـ وە ئەو واسیتەگەریەش تەنیا بۆ ماوەی پـازدە سـاڵەو هـەتا ڕوشت پـەیدا دەکات ـ کە دووایی ڕوشت تەواو بونی ئەو کوڕەیە کە ئەرکی ژییانی خۆیی دەگرێتە ئەستۆ بەڵکو لایەنی زۆری ژییانی دایک و بـابیشی دەگرێتە ئەستوی خۆی چونکە ئەرکی ژییانی دایک و باب لەکاتی پیویستدا لەسەر شانی ئەو لادەوە هەروەها ئەمیرێک بۆ ژێردەستانی یا خاوەن کارێک بۆ کارگەرانی یا مامۆستایەک بۆ خوێندکارەکانی.

جا (خوایەک) بەو هەمو عەزەمەتەوە کە عەبدی خۆیی لە نەبوو

دروست کردووه ـ گەورەی کردووه ـ چاوو گوێ و زوبانی داوەتێ ـ عەقڵ و عیلم و دەرکی داوەتێ ئیرادەو قودرەت و ژیانی داوەتێ دەگەڵ ئەوە (قانونی دینی) (قورئان) واتە قانونی ژیانی بۆ داناوە وە بە وەسیلەی پێغەمبەران پێی ڕاگەیاندون ـ جا ئینسان هەتا زیاتر خوای خۆی بناسێت وە زیاتر پەیڕەوی لێ بکات وە زۆرتر ئیتاعەی بکات (خوا) خۆشتری دەوێ وە زیاتر خەڵات وە چاکەی دەگەڵ دەکات وەکو ڕوناکە خەڵات و چاکەی خوا دەبێ شییاوی عەزەمەت و گەورەیی خۆیی بێت وەکو بەهەشت کە خوای مەزن لە تەعریفی بەهەشتدا فەرمویەتی (وَ فِيهَا مَا تَشْتَهِيهِ الأَنْفُسُ وَ تَلَذُّ الأَعْيُنْ) الزخرف آية ٧١. واتە لە بەهەشتدا هەیە هەرچی نەفس پێی خۆش بێ وە ئارەزۆی بکات و هەرچی چاو پێی جوان بێت و حەزی لێی بکات + وە هەروەها ئینسان هەتا دورتر بێ لە یەزدانی مەزن وە زیاتر بەربەرەکانی قانونی دینی خوا بکاو زۆرتر بێ ئەمری بکات (خوا) ناخۆشتری دەوی و سەزاو تۆڵەی توتندتری لێ وەر دەگرێتەوە ـ ئەوە ڕوناکە تۆڵەو سەزاش دەبی شییاوی گەورەیی وە عەزەمەتی (خوا بێ) وەکو ئاوری (جەهەنەم) واتە ئەوانە کە لە (قانونی دین) قانونێک کە خوا بو ژیانی عەبدانی خویی (واتە ئینسان)ی داناوە لادەدەن وە لە (قورئان) پەیڕەوی ناکەن وە کافر دەبن (خوا) دەیانخاتە عەزابی ـ جەهەننەمەوە ـ کە یەزدانی مەزن لە قورئانی پیرۆزدا فەرمویەتی أَلَمْ أَعْهَدْ إِلَيْكُمْ يَا بَنِي آدَمَ أَنْ لاَّ تَعْبُدُوا الشَّيْطَانَ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُبِينٌ + وَ أَنِ اعْبُدُونِي هَذَا صِرَاطٌ مُسْتَقِيمٌ + وَ لَقَدْ أَضَلَّ مِنْكُمْ جِبِلاًّ كَثِيراً أَفَلَمْ تَكُونُوا تَعْقِلُونَ. سورة يس آية ٦٠ـ ٦١ـ ٦٢

(هٰذِهِ جَهَنَّمُ الَّتی كُنْتُمْ تـوُعَدوُنْ + أِصْـلَوْهٰا الْـيَوْمَ بِـمٰا كُـنْتم تَكْفرُونْ)

ئەی كۆمەڵێ بنی ئادەمی مەگەر ئەمن بە ئێوەم نەگوت وە شوێن شەیتان مەكەون وە فریوی شەیتان مەخۆن كە شـەیتان دوژمـنێكی روناكە بۆ ئێوە بەڵكو بە ڕاستەقینە ئەمن بناسن وە بە گوێرەی قانونی من كە (قورئانە) بڕۆن بەرێوە كە قانونی دینی ئیسلامەوە قانونێكی ڕاستەقینەیە وە هیچ گومانی تێدا نییە بەڵام ئـێوە بـەڕاسـتی ئـەمنو نەناسی وە لەقانونی من پەیڕەوی و نەكرد وە فریوی شەیتانو خواردو كافر بون جا لەتوڵەی ئەوە * ئائەوە جەهەنێمێكە كە بۆ سەزای ئێوە دیاری كراوە ـ وە بچێژن ئەو ڕۆكە تـوندترین عـەزابـی ئـاگـری (جەهەننەم) بەهۆی ئەوە كە كافر بـون * لێـرەدا ئـەگـەر بـەوردی سەرنجی وەڵامەكە بدەین ئەوەمان بۆ ڕون دەبێتەوە كە (قانونی دین) قانونی ژیانی ئینسان قازانج و بەرهەمەكی هەر بۆ ئینسانە بەڵام هەر كەسێک بە تەواوی (خوایی) خۆیی بناسێ وە بە گوێرەی قـانونی (خوا) ژیان بەرێتە سەر (خوا) بەهەشتی بۆ دیاری كردوە و پێی دەبەخشێت + وە ئەوەی كە (خوا) نـەناسێت وە بـە پـێچەوانـەی قانونی (خوا) ژیان بەرێتە سەروە كافر بێت (خوا) جەهەننەمی بۆ دیاری كردوەو پێی دەبەخشێت (لێرەدا ئەو پرسیارەمان بـۆ دێـتە پێش) ئەگەر ئەو كەسەی (خوا) دەناسێت وە بە تەواوی موسوڵمانە وە بە تەواوی بە گوێرەی (قانونی دین) قورئان ژیان دەبـاتە سـەر (خوا) خۆشی دەوێ و (بەهەشتی) بۆ داناوە*

وە ئەو كەسەی خوا نەناسێت و بـە پـێچەوانـەی قـانونی دیـن (قـورئان) دەژیـیت وە كـافرە (خــوا) نـاخۆشی دەوێـیت و

(جەهەننەمی) بۆ داناوە. ئەدی بۆچی زوربەی ئەو کۆمەڵانەی کە (خوا) دەناسن وە لە قانونی (خوا) قورئان پەیرەوی دەکەن - ژیانێکی کەم و کورپیان هەیەو لەبارەی پیشەو سنعەتەوە دوواکەوتون - بەڵام ئەو کۆمەڵانەی کە (خوا) نەناسن وە کافرن و پەیڕەوی لە قانونی (خوا) (قورئان) ناکەن ژیانێکی خۆشیان هەیە وە لەبارەی پیشەو سنعەتەوە پێشکەوتون (بەکورتی کافرەکان ژیانیان خۆشترە لە موسوڵمانەکان) لێرەدا وا دەر دەکەوێ کە یەزدانی مەزن یارمەتی زیاتر بە دوژمنانی خوێی کردوە لە دۆستانی خوێی).

(وەڵامی ئەو پرسیارە ئەوەیە): یەزدانی مەزن - بەهێزی توانایی و زانایی بێ وێنەی خۆیی دو ژین و دو - دونیای بۆ کومەڵێ گیياندار تایبەت + کۆمەڵێ ئینسان دروست کردوە.

یەکەمیان - ژین و دونیایەکی کاتی و تەمەن کورت و دووایی هاتو - ئەوە ژین و دونیای أیستای ئیمەیە کە پێی دەگوترێ ژین و دونیای تاقیکاری وە کردەوە.

دوهەمیان - ژین و دونیایەکی هەمیشەیی - نەگۆڕاو - و دووایی نەهاتووە - کە پێی دەکوترێ + ژین و دونیای بەهرەو داهات (کە مەشهورە بە قیيامەت) چونکە گیياندار هەرچی بیکات لەدونیای أیستادا - بەرودا هاتەکەی (چە بەهەشتیبێ ئەگەر موسوڵمان بێ و لە (قورئان) پەیرەوی کردبێ - یا جەهەننەمی بێ ئەگەر کافر بێ) لە قیيامەتدا وەردەگرێتەوە * دەگەڵ ئەوەدا یەکێک لە (سیفاتە تایبەتیەکانی خوا) عەداڵەتە - کە یەزدانی مەزن بە پێی عەداڵەتە ڕاستەقینەکەی خۆیی دەگەڵ عەبدانی خۆیی ڕەفتار دەکات - جا ئەو کومەڵانەی کە بە تەواوی (خوایان) ناسیوە وە پەیرەوی لە قانونی

(خوا) دەکەن هەمو ئاوات و ئارەزۆیان خۆشی ژیانی هەمیشەیی و دووایی نەهاتویەکە بەهەشتە لە دونیای هەمیشەیی وە دوایی نەهاتودا کە قیامەتە وە خۆشی ژیانی ئەو دونیا کاتیەیان بەلاوە گرینگ نییە بە کورتی قیامەتیان دەوێ و دونیایان ـ ناوێ جا بەهۆی ئەوە یەزدانی مەزن ئاوات و ئارەزۆیەکەیان پێک دێنێ واتە ژیانیکی کەم و کورپیان لەو دونیا کاتیەدا پێ دەبەخشێ وە بەهەشتی بۆ دیاری کردون و لەدونیای هەمیشەیی (قیامەت)دا پێیان دەبەخشێت * بەلاّم ئەو کۆمەلاّنەی کە بڕوایان بە یەزدانی مەزن نییە وە بەپێچەوانەی قانونی (خوا) دەجوڵێنەوە ـ وە بەبونی دونیای هەمیشەیی و دوایی نەهاتو (قیامەت) بڕوایان نییە بەڵکو هەمو ئاوات و ئارەزۆریان خۆشی ژیانی ئەو دونیا کاتیەیە بە کورتی (دونیایان دەوێ و قیامەتیان ناوێ) جا یەزدانی مەزن ئاوات و ئارەزۆیەکەیان پێک دێنی واتە ژیانێکی خۆش وە ماڵ هێزو توانایەکی زۆریان لەو دونیا کاتیەدا بۆ ماوەیەکی کورت پێ دەبەخشێت وە لە ژیان و دونیای هەمیشەییدا (قیامەت) لە ڕەحمەتی خۆی بێبەشیان دەکات وە دەیانخاتە (جەهەننەمەوە) وەکو یەزدانی مەزن لە قانونی ژیانی ئینسان (قورئان)دا فەرمویەتی: (مَنْ كٰانَ يُرِيدُ حَرْثَ آلاخِرَةِ نَزِدْ لَهُ فِي حَرْثِهِ + وَ مَنْ كٰانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيا نُؤْتِهِ مِنْهٰا وَ مٰا لَهُ فِي الآخِرَةِ مِنْ نَصِيبٍ) سورة شوراء آية ٢٠.

کەسێک ئاوات و ئارەزۆیی لە هەوڵ و خەباتی هەمیشەیی خۆیدا خۆشی ژیانی ئاخیرەتە (واتە بەهەشتە) ئێمە هێزو توانایی زیاتری بۆ هەوڵ و خەباتی زیاتری بۆ گەیشتن بە ئاواتەکەی پێ دەبەخشین وە هەر کردەوەیەکی چاکەی لە (دە بەرابەرەوە) هەتا هەزار بەرابەر وە

زیاتریش چاکەی دەگەڵ دەکەین واتە (بەهەشتی) پێ دەبخشین * وە هەروەها * کەسێک ئاوات و ئارەزۆیی لەهەوڵ و خەباتی هەمیشەیی خویدا خۆشی ژیانی دونیای کاتیە ـ ئیمە هێزو توانایی زیاتری بۆ هەوڵ و خەباتی زیاتری بۆ گەیشتن بە ئاواتەکەی پێ دەبەخشین وە بە ئاوات‌و ئارەزۆی خۆی دەگەیەنین (واتە خۆشی ژیانی دونیای کاتی وەکو ماڵ و سامان و پلەو پایەی پێ دەبەخشین) بەڵام بە تولەی ئەوە کە ئێمەی نەناسیوە وە پەیرەوی لەقانونی ئێمە نەکردوە لەخۆشی ژیانی (ئاخیرەتدا) بەشێکی نییە (بەڵکو توندترین سەزای پێ دەچێژین کە شوێنی هەمیشەیی جەهەننمە) لێرەدا ڕون بۆوە کە یەزدانی مەزن ئەو پەڕی چاکەو یارمەتی دەگەڵ دۆستانی (واتە پەیڕەوانی) خۆی دەکات چونکە سەرەڕای ئەوە کە ژیانێکی ڕێک‌و پێک‌و پەڕ لەشەرافەت و عیززەت ویژدانی ئینسانی لەو دونیای کاتییەدا بۆ دیاری کردون لە ژیانی دونیای هەمیشەیی و دوایی نەهاتوش‌دا (قییامەت) ئەو پەڕی خۆشی‌و سەربەرزی واتە (بەهەشتی) بۆ دیاری کردون + بەڵام ئەوپەڕی قەهرو غەزەبی بۆ دوژمنانی واتە (ئەوانەی نایی ناسن و پەیرەوی لێ ناکەن) نواندووە چونکە لەو دونیا کاتیەدا ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایەی بەسەر دارژتون بەهۆی ئەوە توشی هەزاران تەنگوو چەڵەمەو شەڕو کوشتن‌و هەمو جۆرە فەسادێک بوون دەگەڵ ئەوە کەوتونە شوین هەواوو هەوەسیی شەیتانی کە لەهەمو عیززەت و شەرافەت و کەرامەت‌و ـ ویژدانی ئینسانی بێبەش بوون هەروەکو حەیوان و پاتاڵ دەژین سەرەڕای ئەوەش لە ژین‌و دونیای هەمیشەیی و دووایی نەهاتو (قییامەت)دا ئەو پەڕی ئازارو ئەزیەتی عەزابی جەهەننەمی بۆ دیاری کردون +

هەروەها پیغەمبەری ئیسلام (حەزرەتی موحەممەد) دورودی خووای لێ بێ فەرمویەتی: (الدُّنْيا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ وَ جَنَّتُ الْكَافِرِ) واتە دونیا زیندانی موسوڵمانانەوە بەهەشتی کافرانە + ئەگەر بەووردی بیر لەو حەدیسە بکەینەوە بۆمان دەر دەکەوێ کە ڕاستەقینەیە چونکە موسوڵمان لەنێو چوار چێوەی قانونی دیندا دەژیت و دین وەکو دیوارێک ئەوانی مەنع کردون لەهەمو جۆرە تاوان و فەسادێک بەڵام کافر چوارچێوەیەکی نییە (چونکە قانونی دینی قبوڵ نەکردووە و بڕوای پێی نییە) بەڵکو ئەوەی چاوی پێی جووانبێ و بۆیی بکرێ تەماشای دەکات وە ئەوەی نەفسی پێی خۆشبیو دەسەڵاتی هەبێ دەیکات واتە ئەو تۆزە ژینەی کە هەیەتی لەو دونیا کاتیەدا بۆوی بەهەشتە چونکە چوارچێوەیەک لە ڕێگای ژییانی خۆیدا نابینی بەڵکو وەکو لە پێشەوەدا گوتمان (هەر وەکو حەیوان و پاتاڵ دەژین).

## (پرسیار)

جێگای ئەوەیە پرسییار بکرێت خۆ بەکەمی لەنێو ئەوانەی کە بەڕاستی (خوا) دەناسن وە پەیرەوی لە قانونی خوا (قانونی دین) دەکەن خاوەن دەسەڵات و سەرمایەدار لەهەمو زەمانەکاندا هەڵکەوتون هەروەها لەنێو ئەوانەی کە (خوا) نەناسن وە پەیڕەوی لەقانونی خوا (قانونی دین) ناکەن لەهەمو زەمانەکاندا بەکەمی بێدەسەڵات و هەژار هەڵکەوتون کە ئەوە پێچەوانەی وەڵامی ڕابردویە.

## (وەڵام)

وەڵامی ئەو پرسیارەش ئەگەر بە ووردی بیری لێوەکەین زۆر

ساکاره وه بۆمان دەردەکەوێ کە وەڵامی ڕابردو تایبەت (ئایەت و حەدیثە)کەی ڕاستەقینەو هیچ گومانی تیدا نییە سەرەتا (ئەو ئایەتەی) کە لە وەڵامی ڕابردو ـ داهاتووە کە (یەزدانی مەزن لە قورئان)دا فەرمویەتی: (مَنْ كَانَ يُرِيدُ حَرْثَ الآخِرَةِ نَزِدْ لَه فِى حَرْثِهِ) (الشّوراء ـ آية ٢٠). واتە کەسێک هەمو ئاوات و ئارەزوی لەهەوڵ خەباتی هەمیشەیی خۆیدا خۆشی ژیانی (ئاخیرەتە) واتە (بەهەشتە) ئێمە هێزو توانایی زیاتری بۆ هەوڵ و خەباتی زۆرتری بۆ گەیشتن بە ئاواتەکە پێ دەبەخشین ـ واتە ـ بەهەشتی پێ دەبەخشین + ئەو ئایەتە پیروزە ئەوەی تێدا نییە کە لە ژیانی ئەو دونیا کاتییە دابێ بەشەو هەر دەبێ هەژار بێ بەڵکو باڵەو دونیا کاتییەشدا ژیانێکی خۆشی هەبێ + یان کە (پیغەمبەری ئیسلام) فەرمویەتی: (الدُّنْيَا سِجْنُ الْمُؤْمِنِ) + واتە دونیا زیندانی موئمینانە مەبەست ئەوەیە کە ئەوانەی بە تەواوی بە گوێرەی (قانونی خوا قورئان) دەژین لەنێو چوار چێوەی (قانونی دین قورئان)دا ژیان دەبەنە سەر کە (دین) وەکو دیوارێکی پۆلا ئەوانە لەهەمو جۆرە تاوان فەسادێک دەپارێزی هەروەکو زیندان ـ ئینسان دور دەخاتەوە لەهەمو کارو کۆشش و پێویستەکانی ژین ـ دینیش أینسانی خواناس بە ڕاستی دور دەخاتەوە لەهەمو تاوانو فەسادو هەواو ئارەزۆیی شەیتانی نەفس واتە دین بۆ أینسان پاک زیندانە. لێرەشدا واتە لەو (حەدیثە) پیرۆزەشدا ئەوەی تێدا نییە کە (موئمینەکان) لە ژیانی ئەو دونیا کاتییەدا بێبەشن وە هەر دەبێ هەژار بن (ژیانی خۆشیان هیچ پێچەوانە نییە) چونکە هەر وەکو لە پیشەوەدا بەیانکرا (یەزدانی مەزن) لە قانونی ژیانی ئینسان (قورئان)دا فەرمویەتی: (وَ لاَ تَنْسَ

نَصيبكَ مِنَ الدُّنْيا) لەبیرت نەچێ بەشی خۆت لە دونـیایەدا واتـە هەمو ئینسانێک بەشی هەیە لەو دونیا کاتیەش‌دا (جا ئـەو ئـینسانە خواناس و بەدین بێ، یان کافرو بێ‌دین بێ) لێرەدا زۆر ـ ڕونـاکـە ژیانی خۆش بۆ ئینسانی (خواناس و بەدین) پێچەوانەی (قانونی دین) نییە بەڵکو حەقیقەت و ڕاستەقینە ئەوەیە هەرکەس بە ڕاستی پەیڕەوی لە (خوا) بکات ژیانێکی سەربەرزو خۆشی هەیە لەدونیاو قیامەدا * هەروەها کە ـ (یەزدانی مەزن) فەرمویەتی: (وَ مَنْ كـانَ يُرِيدُ حَرْثَ الدُّنْيا نُؤْتِهِ مِنْها وَ مالَهُ فـي الآخِـرَةِ مِـنْ نَـصيبٍ) کەسێک ئاوات‌و ئارەزۆی لە هەوڵ و خـەباتی هـەمیشەیی خـۆیدا خۆشی ژیانی دونیای کاتییە (وە بڕوای بە خواو قانونی خوا نییە) ئێمە هێزو توانایی زیاتری بۆ هەوڵ و خەباتی زۆرتری بۆ گەیشتن بە ئاواتەکەی پێ دەبەخشین واتە (خۆشی ژیانی دونیای کاتی وەکو ماڵ سامان پلەو پایەی پێ دەبەخشین) (بـەڵام لەخـۆشی ژیـانی ئاخیرەتدا بێ‌بەشە) ئەو ئایەتە پیروزە ئەوەی تێدا نییە کە (ئینسانی کافر) لە تەواوی ژیانی (کاتی) خوێدا دەبێ ئەو ماڵ‌و سامان‌و پلەو پایەی هەبێت بەڵکو لە هێندێک لەماوەی تەمەنی دونیای کاتیدا ئەو (بونە)ی هەبێ‌و دووایی بێ دەسەڵات و هەژار بێ یان هەر لە تەواوی تەمەنی هەژارو فەقیر بێ وەکو ڕوناکە لە نێو کافرانیشدا هەژارو فەقیر هەن ئەوە هیچ پـێچەوانـەی (قـانونی دیـن) نـییە وە هـەروەها کـە (پیغەمبەری ئیسلام) لە حەدیثی ڕابردودا فەرمویەتی: (... وجـنّة الکافر) واتە دونیا بەهەشتی کافرانە لەوەشدا دەرناکەوێ کە دەبـێ کافر لە تەواوی ژیانی (کاتیدا) لە خۆشی‌دا بێ بەڵکو لە هێندێک لە ماوە ژیانی (کاتیدا) بێ‌دەسەڵاو هەژار بێ پـیچەوانـەی (قـانونی

دین) نییه دەگەڵ ئـەوەدا (ئـەو حـەدیسە) کـە دەفـەرموێت دونـیا بەهەشتی کافرانە مەبەست ئەوەیە کافر لەنیو چوارچێوەی (قـانونی دین) دانین وە بەرگریەک لە ڕێگای ژیانی خۆیاندا نابینن وە ئەوەی نەفسییان پێی خۆش بێ‌و بۆیان بکریت دەیکـەن سـەرای ئـەوەش دەبێ ئێمە ئەو ڕاستەقینەیە زۆر باش بزانین کە ژینی دونیای کـاتی هەرچەندە خۆش و بـەرزتر بـێت لەبـەرابـەر خـۆشی بـەهەشتدا جەهەننمە و ژینی دونیای کاتی هەرچەندە بێدەسەڵات و هەژار و ناخۆشتر بێت لەبەرابەر عەزابی جەهەننەمەوە بەهەشتە جا بـەهۆی ئەوە ڕاستەقیینەیە کە دونیا زیندانی موسوڵمان وە بەهەشتی کافرانە بۆ ڕون کردنەوەی ئەو مەبەستە پێویستە ئەوە بخەینە بەرچاو کـە لە عالەمی ئیسلامیدا هەزاران میلیاردێر هەبوە کە بـەرزتر لە هـەمویان لەباری هێزو توواناى ماڵیدا دو نەفەر هەبوون ـ یەکەمیان ـ حەزرەتی = ئەسکەندەر = (ذوالقرنین) کـە سـەرپەرستی هـەمو دونـیایی لە دەست خۆیی دابووە وە ئەوی‌تریان = حەزرەتی (سولەیمان) درود خوایان لەسەر بێ کە حەزرەتی سولەیمان سەرەرای ئەوە کە هـەمو دنیای لەژێر دەستدا بووە (یەزدانی مەزن) بە لوتفی خۆیی دەعباو حەیوانات و ئەجیینەشی لە ئی‌ختیار ناوە ـ تەنانەت لەجێی ماشین‌و تەیارە بای لەژێر فەرماندا بووە، بو هەر شوێنکێ پێویستبایە ـ (با) تەختی (سولەیمانی) دەبرد بۆ ئەو شوێنە بەڵام هیچ‌یەک لەوانە تام‌و لەزەتیان لەو هەمو توواناى سەروەت و سامانە ـ نـەکـردوە بـەڵکو دەگـەڵ ئـەو هـەمو ڕەنـج و ئـازارەی بـو بـەڕێوە بـردنی کـۆمەڵی گییانداریان کەوتوۆتە سەرشان هەمیشە لەترس و خوفی یەزدانـی مەزن لەشین‌و گریان و دڵە خورپەدا بوون و هیچ تام‌و لەزەتێکیان لەو

ژینە کاتیە نەکردووە ـ لە مێژودا نوسراوە کە حەزرەتی (سولەیمان) هەمیشە نانی جۆیی خواردووە (ئاسەفی بنی بەرخییار) کە وەزیری هەمو کارو ئیشی وی بووە دەڵێ لێم پرسی بۆچی وا خـۆت ئـازار دەدەی لەو هەمو نیعمەتە کە خوا بەتوێی داوە دەستی بۆ نـابەی وە بە(نانی جۆ) ژییان دەبەیە سەر = لەوەڵامدا ـ فەرمویەتی بۆیە نانی جۆ دەخۆم ـ وە خۆم تێر نـاکـەم لە خـواردنو نـیعمەتی چـاکـی (یەزدانی مەزن) هەتا کۆمەڵێ فەقیرو مـوحتاجم لەبـیر نـەچنەوە ـ چونکە لەو حاڵەدا کە یەزدانی مەزن ـ سەرپەرەستی عەبدانی خوێی لە ئی‌ختیاری منناوە ئەگەر فەقیرو هەژارم لەبیر بچنەوە و یا حەقی بەشخوراوێک لە بەشخۆرەکە وەرنەگرمەوە لەلای خووا تاوانـێکی گەورەیە دەکەومە نـێو سـەزای تـوندی یـەزدانـەوە ـ حـەزرەتی ـ (ئەسکەندەر) هەریم بـە هـەریم دەگـەڕا ـ خـوا نـەناسو یـاغیو بەشخۆرەکانی سەرکوت دەکەرد و خواناسی بەنێو عەبدانی خوادا بڵاو دەکردەوە بەڵام لە ژییانیدا نەبو جـارێک تـیر بـخوات بـەڵکو هەمیشە برسی بووە وە تەنانەت ئاویشی بە تەواوی نەخواردۆتەوە ـ کە لێیان پرسیوە بۆچی خـۆت بـرسیو تـینو دەکـەیو لەوەڵامـدا فەرمویەتی (یەزدانی مەزن) ئەرکی سەرپەرستی عەبدانی خوێی، بو ئەوە، لە ئیختیار من نەناوە، کە بە گوێرەی ئارەزوێی نەفس پخۆم و پخۆمەوە و رابوێرم ـ بەڵکو بۆ ئەوە دەسەڵاتی سەرزەوی بەمنداوە کە خواوو پەیڕەوی لەقانونی خوا بە عەبدانی ویی بناسێنم ـ وە ئەگەر تێر بخۆم بیرو خەیاڵم لەسەر هەژارو تێماوەکان نامێنی، وە هەروەها، (بە گوێرەی حـەدیسی سـەحیح) حـەزرەتی پـیغەمبەری ئـیمە لە ژییاندا ڕۆن و گوشتی پێکەوە نەخوارد وە زوربەی ساڵ بەڕۆژو بووە

بۆ ئەوە هەمیشە لەبیری هەژارو داماودا بێت‌و ترس‌و خۆفی خوایی لەبیر نەچێتەوە ـ لەژیانی حەزرەتی (عومەری کوڕی خەتتاب)دا دەگێرێتەوە کە حەزرەتی (عومەر) زۆر جاران گریاوە و فەرمویەتی: (یا لَیْتَ أُمّ عُمَرَ لَمْ تَلِدْ عُمَرَ) خۆزیاکو دایکی ـ عومەر ـ عومەری هەر نەبووایە ـ بۆ دڵدانەوە سەحابەکان فەرمویانە تۆ بۆچی دەترسێیی، خۆ لە (بیعةالرّضوان)دا یەزدانی مەزن بەڵێنی بەخشین‌و خەڵاتی بەهەشتی بە کۆمەڵێک داوە کە ئەتۆ یەکێک لەوانی خۆ یەقینە بەڵێنی خوا ـ (إِنَّ اللّٰه لا یُخْلِفُ المیعادُ) پێچەوانەو خیلافی تێدا نییە لەوەڵامدا فەرمویەتی، ئەو بەڵێنەی (خووا) ڕاستەو یەقینە ـ بەڵام دەترسم ئەو بەڵێنە بە مەرجێک بێ کە پێم بەرێو نەچێت‌و یەزدانی مەزن بەتۆڵەی ناعەداڵەتی وە یا سەر پێچی لە فەرمانی خۆیی بمخاتە عەزاب و ئازارەوە ـ جا ئەگەر مو بەمو مێژوی ژیانی پێغەمبەران و سەردارە ئاینیەکانی ئی‌سلام هەڵکوژین و سەرنجی بدەین کە لەو کتیبەدا ناکرێ بەیان بکرێ چونکە شوینکێ زۆری دەوێ ـ بومان دەردەکەوێ کە ژیانی هەمویان بە تێکرایی لەژیانی زیندانی ناخۆشتر بووە ـ بەڵام پێچەوانە سەردارو سەرۆکی و ساماندارەکانی بێ‌بڕوا بەخووا ـ و دژی قانونی خووا کە لەژیانی خویاندا ـ پەی‌ڕەویان لەهیچ قانون و یاسایەک نەکردوە هیچ قانون و یاسایەک ناکەن بەڵکو بەگوێرەی ئاوات‌و ئارەزۆی خویان لەدونیادا، ڕادەبوێرن، دونیا بۆ ئەوانە بەهەشتە.

# بەشی نۆهەم
# بەیانی قانونی دینه

لێرەدا شوێنی ئەویە کە پرسیار بکەین (قانونی دین) کە قانونی ژیانی ئینسانە چۆنەو دین چ یاسایەکی بو ژیانی بونەوەر داناوە کە مسوگەر دەبێ پەیرەوی لێ بکرێ.
وەڵام سەرەتا دەبێ ئەو زاتە بناسین کە قانونی ـ دینی داناوە ـ وە بونەوەری هێناوەتە بون، کە (یەزدانی مەزنە).

## (ناسینی یەزدانی مەزن دو ڕێگەی هەیە)

یەکەم فکری و عەقلی ـ دوهەم نەقلی کە لەزانیارو نوسراوە وەردەگیرێ، جا ئەو بەشی دوهەمە، بەبێ بەشی ئەوەڵ بەکەڵک نایە ئەرگە ئەتۆ بڵێ خوا هەیە چونکە لەفلان زانیارەم بیستوەویان لەفلان کتیبەمدا چاوم پێکەوتووە وە بەیەقین و براوای خۆت نەتناسبێ و بەڕاستەقینە بروای پێی نەبێت ئەو بیستنە و دیتنە لە نوسراوەدا بە کەڵک نایە چونکە ایمانی تەقلیدی دروست نییە ـ بەڵکو دەبێ بە بیرو عەقڵ و هۆشی خۆت یەزدانی مەزن وەبینی و بەقینت سەر بونی بێوینەی وی پەیدایکەی جا دوایی لە دەلائیل نەقلی کە بەشی

دوهەمە واتە لەزانیارو نوسراوە گەورەیی و هێزو توانای خوا فیر بێ.

بەشی یەکەم ـ هەمو ئینسانێک دەبێ بە فکرو بیرو عەقڵی خویی، موبە مو، سەرنجی دونیایە بدات. بیر بکاتە وە لە زەمین کە پێکهاتووە لە خاک و سەنگ و دارو گییا وە خاک میلیونها رەنگی هەیە وە لە نێو ئەو رەنگانەدا میلیونها مەعدەن هەیە ـ هەر لە گڵی دیزە و کـوزە وە هەتا دەگاتە ئاسن و پۆلاو مس و گوگرد زێوو زێڕو هەزاران شتی تر سەنگ میلیونها نەوعی هەیە» کە هێندکیان ئەو پەری بەهاو قیمەتیان هەیە وەکو دوڕو مروارە و سەدەف و گەوهەرو هەزاران شتی تر. دار میلیونها نەوعی هەیە لە خاوەن بەرو بێبەر، ئەوەی کە بەری هـەیە میلیونها رەنگ و شکڵ و تامی هەیە، گییا مـیلیونها نـەوعی هـەیەو میلیونها رەنگ و بۆنی هەیە کە هەموو دەواو دەرمان لە دارو گـییاوە پیکدێن.

بەشێکی دیکەی ئاوە، هـێندیک لەنـێو زەوی، هـێندیکی زەوی دەورەی داوە، هـێندیکی ئـاو دەوری داوە وە لەنـێو ئـاوو زەویـدا میلیونها بونەوەر بووە ـ و هەیەو + دەبـێ کـە هـەریەکـەی ڕەنگ و دیمەن و خووخدەو ڕەوشی لێک جـورایـە ـ دیسـان سـەری بـەرز بکاتەوە ـ بە بیریکی ورد تەماشای ئاسمان بکات فکر بکـاتەوە لە میلیاردها، ئەستێرەو مانگ و ڕۆژ، کاتەکانی ساڵ ـ بەهارو هـاوین و پاییزو زومستان وەلێکی بداتەوە وەک ئەو دونیاپان و بەریتە کە هەتا ئەوڕۆ هیچ عەقلێک بە تەواوی بۆی دەرک نەکراوە چـۆن دروست بووە و لە ڕوژێکەوە کە دونیا هەیە ـ هەتا ئـەو ڕۆ لەسـەر قـانون و میزانێک ڕاگیراوە ـ لەشەو و ڕۆژو مانگ و ساڵ و فەسڵەکـان هـیچ گورانێک نییە بەڵکو هەر بە شێوەیەک دین و دەڕۆن ـ لە لایـەکـی،

دیکەوە بیر بکاتەوە لەسەرەتای دونیاوە هەتا دەگاتە ئەورۆ ـ لە گۆزەیەکی قورنیە و گەسک و بیلێکی دار ـ هەتا دەگاتە بەرزترین سنعەت وەکو (ئاپۆلۆ) (ئەتۆم) کامپیوتیر، هیچ شتێکگ لەخۆوە دروست نەبوو، بەڵکو هەمو جۆرە بەرهەمێک زانایەک ڕەنج و ئازاری زۆری کیشاوە، هەتا دورستی کردو، کەوا بێ ئەو دونیا پانو بەرینە کە هاتا ئەو رۆ هەزاران فەیلەسوف و زانیاری تیدا گێژو حۆل بوون و بەراستەقینە چونیەتی دونیایان بۆ رون نەبوتەوە لە خۆوە دروست نەبو، بەڵکو خالیقێک وەدی هێناوە وە بۆ ئەو ڕێگە ناسینە یەزدانی مەزن لە قانونی دین (قورئان)دا ئی‌نسانی ڕێ‌نوێنی فەرموە
+ سورەی بەقەرە ئایەتی (١٦٤) دەفەرموی:

(إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمٰوَاتِ وَ الْأَرْضِ وَ اِخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَ النَّهَارِ وَ الْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنْفَعُ النَّاسَ وَ مَا أَنْزَلَ اللهُ مِنَ السَّمَاءِ مِنْ مَاءٍ فَأَحيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِنْ كُلِّ دَابَّةٍ وَ تَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَ السَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَ الْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَعْقِلُونَ.

واتە لە خەڵق‌بونی ئاسمان و ڕاوەستانی لەحەوا بێ‌ستون وکۆڵەکە وە لە خەڵق بونی زەوی کە سفرەیەکە بۆ هەمو گیانداریکی یارو نەیار وە لە خەڵقی بونی شەوو ڕۆژ کە بە شوێن یەکتردا، دین ئەویان تاریک و ڕەش ئەمیان ڕوناک‌و سپی جاریک شەو کورت و ڕۆژ دریژ دەبێ‌و دەمێکی دی پێچەوانە ڕۆژ کورت و شەو دریژ دەبێ ـ بێ‌ئەوەی هیچ بونەوەریک دەستی تێ‌وەرداو، یان دەسەلاتی هەبێ وە لە پەیدابونی کەشتی کە لەسەر ئاوی دەڕوا و بونەور کەڵکی لێ وەردەگریت و لە پەیدابونی ئەو ئاوەی کە یەزدانی مەزن لە ئاسمانەوە دەی‌نێریتە

خوارێ وە ئەرزی مردو ـ واتە وشکو تینوی پێ زیندو دەکاتەوە کە هەمو جۆر دارو گییا دەڕوێنی ـ وە لە بونی هەمو بونەوەریک کە لەسەر پشتی زەوی بلاو دەبنەوە وە لە هاتنی ـ با ـ کە هەر جارێ لەلایەکەوە وە هەرکاتە بە شێوەیەک دێو دەڕوا ـ وە لە پەیدابونی هەور لەبەینی ئاسمان و زەوی + ئاشکراو رون دەبێتەوە بەلگەو دەلیلی بەشێوەی یەقین بۆ هەر گییاندارێکی خاوەن عەقلی سلیم لەسەر بونی وەدی هێنەرک تەنها پێکهێنەر و فەرماندەری ئەو کائیناتەیە وە خالیقش نابێ دو یا چەندێک بن چونکە ئەگەر دو ـ یا چەندێک بن وەکو پادشاو سەروکەکانی دونیایە ـ لەسەر ملکی یان لەسەر فەرمان ـ یان لەسەر پیشتیوانی و خۆشەویستی لەیەکتر تورەو دڵڕەنج دەبون و کێشەو نیزاعیان دەکەوتە بەین و بەهۆیی ئەو دوبەرەکیە دونیا دەشێواو دەستی کەم ئەگەر بەتەواویش دونیا لەبەین نەچویایە ئالۆ گۆرێکی تیدا پەیدا دەبو ـ لەبەر ئەوە لەسەرەتای دونیاوە هەتا ئەورۆ دونیا هەر لەسەر شێوەیەکەو هیچ گورانیکی تیدا نییە بەلکو هەر وەکو خۆیی سالو مانگو ڕۆژو شەو و فەسلەکان دێنو دەڕۆن ڕوناکە و یەقینە کەهەر خالیقێکو خودایەک ئەو دونیایەی بەوجود هێناوە وە شەریک و یارمەتی دەری نییە وە ئەو بیرو بڕوایەش دەبێ ڕاستەقینەو یەقینی بێ، یەقینیش ئەوەیە کە پێچەوانەی قبوڵ نەکرێ وەکو ئەوکە لەکاتی نیوەڕۆدا لە حالێکدا ڕۆژ لە ئاسمانی هەساودایە و زانایەک تەماشای دەکات لەو حالەدا ئەگەر هەمو عالەم کۆوە بێت و بلێن ئێستا شەوە ئەو زانایە بڕوایان پێ ناکاو بەدرۆیان دەکاتەوە چونکە یەقینی لەسەر ڕۆژ هەیە ـ جا خواناسینی بەڕاستیش هەر وەکو ئەو زانایە کە چاوی لە (قورسی) ڕۆژێیەو

یەقینی هەیە دەبێ ئینسان یەقینی لەسەر بونی خوا بەهەمو تایبەتیەکانیەوە هەبێ و بیرو بڕوای ڕاستەقینە هەبێ وە ئەگەردە نێو ئاگری باوێن و بی‌سوتێنن خوای هەر لە بیربێت و یەقینی لەسەر بونی بی‌وێنەی هەبێ و لەبیری نەچێتەوە وە ئەو مەبەستەش (یەزدانی مەزن) لە قانونی دین (قورئان)دا ڕای‌گەیاندوە کە فەرمویەتی (لَوْ كَانَ فِيهِمَا آلِهَةٌ إِلاَّ اللهَ لَفَسَدَتَا) سورە انبیاء آیە ٢٢ ـ واتە ئەگەر لە ئاسمان و زەویدا چەند (یەزدانێک) یان دو یەزدان هەبان ئاسمان و زەوی دەشێوان و خەرادە بون دووای ئەوە کە بەلێکولینەو پشکنینی فکرو عەقلی یەقین پەیدا بو ـ کە وەدیهێنەری (کائینات) هەمو بونەوەروە ریک لە گیاندارو بێ گیان خالیقێکە تەنیا ـ بێ‌شەریک و بێ‌وەزیرو موشاویرو هاوکار ـ پیویستە بە دەلائیلی نەقلیش چۆنیەتی ئەو خالیقە بە تەواوی بناسین ـ جا زۆر ڕوناکە و یەقینە هیچ دەلیل و بەڵگەیەک لە فەرمودەی ئەو خالیقە (یەزدانی مەزن) یەقین و بەرزتر نییە ئەویش قانونی ژین (قورئان)ە جا بۆیە پەنا دەبەین بۆ قانونی ژین (قورئان) وە هەمو مەبەستەکان ڕاستەو خۆلەوێی وەر دەگرین.

## (بەشی یەکەم لەبەشی نۆهەم)

یەزدانی مەزن (خالیقی کائینات) وەدی هێنەرێی هەمو بونەوەرێکە لە گیاندارو بێ گیان سورة‌الانعام آیەتی ٧٣ دەفەرموی: (وَ هُوَ الَّذِى خَلَقَ السَّمَاوات وَ الأَرْضَ بِالْحَقِّ) یەزدانێکی ئەو تۆیە کەبە حەق ئاسمانەکان و زەوی دروست کردووە. (قُلْ اللهُ خَالِقُ كُلِّ شَيْىءٍ وَ هُوَ الْوَاحِدُ الْقَهَّار) سورە رعد آیە ١٦ + ئەتۆ بڵێ (ئەی موحەممەد ﷺ) یەزدان وەدی هێنەری هەمو بونەوەرێکە ـ کە تەنهایە

و خاوەنی قەهرو ڕقی زۆرە بۆ ئەو کەسانەی بێئەمری دەکەن ئەو ئایەتە سێ بەڵگەی تیدایە ـ یەکەم خالیقە ـ دوهەم ـ تەنیایە ـ سێهەم ـ تۆڵە وەرگرە لەو عەبدانە کە بێئەمری دەکەن. (البقرە: ٢٩) (هُوَ الَّذي خَلَقَ لَكُمْ * ما في الأَرْضِ جَميعاً) یەزدان خووایەکی ئەو تۆیە وەدی هێناوە لەبۆ ئێوە هەمو ئەو بونەوەرانەی لە ئەرزێدان بەتێکڕایی لەو ئایەتەدا چونکە یەزدانی مەزن بە وشەی (خَلَقَ لَكُمْ) ڕویی کردۆتە ئینسان چەند بەڵگەی لێ وەدەر دەکەوێ ـ یەکەم یەزدان خالیقی هەمو کائیناتە دوهەم ـ ڕێزو بەرزی ئینسان زیاترە لە بونەوەرەکانی دی ـ سێهەم هەرچی یەزدان لە ئەرزێ وەدی هێناوە ـ بۆ نەفعو قازانجی ئینسانە هەر وەکو (الواقعە) لە ٥٨وە تا دەگاتە ٧٢ بەڵگەی ڕوناکن لەسەر خالیقییەتی یەزدان و ئەوەی لە ئەرزێ وەدی هێناوە بۆ نەفعو قازانجی ئینسانە لەو بارەدا ئایەت زۆرن کە لەو کتێبە کورتەدا ناکرێ بەیان بکرێن ـ

## (بەشی دوهەم لەبەشی نۆهەم)

## (یەزدانی مەزن (مالک) خاوەنی هەمو بونەوەرێکە)

(طە: ٨) (لَهُ ما فِي السَّماواتِ وَ الأَرْضِ وَ ما تَحْتَ الثَّرى)

ملکی یەزدانی مەزنە هەرچی لە ئاسمانو ئەرزو نێوان ئاسمانو ئەرزوە لەژێر خاکێ و ئاوێ دایە + (الروم: ٢٦) (وَ لَهُ ما فِي السَّماواتِ وَ الأَرْضِ كُلٌّ لَهُ قانِتونَ) ملکی یەزدانی مەزنە هەرچی لە ئاسماندایەو هەرچی لە ئەرزێدایە وە هەمویان بۆ یەزدانی مەزن ملکەچ لەژێر فەرمانی ـ وی دان). (الاعراف: ٥٤) (وَ الشَّمْسُ وَ الْقَمَرُ وَ

النُّجوُمُ. مُسَخَّراتٍ بِاَمْرِهِ اَلاٰ لَهُ الْخَلْقُ وَ الْأَمْرُ تَـبٰارك اللهُ رَبُّ الْعٰالمين)

ڕۆژو مانگ‌و ئه‌ستێره مل که‌چ له‌ژێر فه‌رمانی وه‌دی هێنه‌ری - خۆیاندان - ئاگاداربن که هه‌ر له‌بۆ ئه‌و خالیقه شییاوه خـاوه‌نی و فه‌رمان ڕه‌وایی - به‌رزی و پیرۆزی هه‌ر له‌بۆ - ئه‌و خالیقه‌یه‌که ته‌ربیه‌تی هه‌مو بونه‌وه‌رێکی داوه - ئه‌وآیه‌تانه به‌ڵگه‌ن له‌سه‌ر ئه‌وه که مالیکی کوڵلی ته‌نها یه‌زدانه وه له‌و باره‌وه ئایه‌ت زۆرن کـه لێـره‌دا جییان نابیته‌وه.

## (به‌شی سێهه‌م له به‌شی نۆهه‌م)

## (حاکمیّه‌ت فه‌رمان ڕه‌وایی یه‌زدانه)

(الأنعام: ٥٧) (اِنِ الْحُكمُ اِلاّٰ لِلّٰه) حوکم و فه‌رمان به ته‌واوی هه‌ر بۆ یه‌زدانی مه‌زنه‌و فه‌رمان‌ڕه‌وایی هه‌مو بونه‌وه‌رێک ته‌نیا بۆ خووایـه، (القصص: ٧٠) (لَهُ الْحَمْدُ في الْأُولىٰ و فِيالْآخِرَةِ وَ لَهُ الْحُكْمُ وَ اِلَيْهِ تُرْجَعوُن) هه‌ر بۆ یه‌زدان شییاوه سوپاس و فه‌رمان‌به‌ری له‌دونـیاو په‌سلان و هه‌ر بۆ یه‌زدان شییاوه داوه‌ری و فه‌رمان‌ڕه‌وایی وه هه‌مو بونه‌وه‌رێک مل که‌چ بۆلایی یه‌زدان ده‌گه‌ڕێته‌وه. (الكهف / ٢٦) (مٰا لَهُمْ مِنْ دُونِهِ مِنْ وَلِيٍّ وَ لاٰ يُشْرِكُ في حُكمِهِ اَحَداً) نـییه له‌بـۆ هـیچ بونه‌وه‌رێک سه‌رپه‌رست‌و یـارمه‌تی ده‌رێکـی جـودا له یـه‌زدان له مه‌یدانی حیسابدا وه له داوه‌ری و حوکم‌دا شـه‌رێک بـۆ یـه‌زدان و

شەریکی بۆ فەرمان‌و ایرادەی خوێی نییە. (الانعام / ١٨) (وَ هُوَ الْقاهِرُ فَوْقَ عِبادِهِ وَ هُوَ الْحَكِيمُ الْخَبِيرُ) تـەنها یـەزدانـە دەسـەلات و غەلبەی هەیە لەسەر هەمو عەبدان (بونەوەر) و هـەر ئـەو بـەرزتر حاکم‌و داوەرە و ئاگـادارە لەسـەر هـەمو بـیرو کـاری (عـەبدان) (البقرة/٢٥٥) (مَنْ ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِنْدَهُ إِلاَّ بِإِذْنِهِ) هیچ گییان لەبەرێک توانای تکایی بەخشینی لەلای یەزدان نییە ئەگەر یەزدان فەرمانی پێ نەدات. (یس / ٨٣) (بِيَدِهِ مَلَكُوتُ كُلِّ شَيْءٍ وَ إِلَيْهِ تُرْجَعُونَ) لەژێـر فـەرمان‌و دەسـەلاتی یـەزدان ـ دایـەبون و ژیـانی هـەمو بونەوەرێک و هـەروەلای یـەزدان ـ دەگـەڕێنەوە لەکـاتی خـۆیدا. (یونس/١٠٧) (وَ إِنْ يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلا كاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَ إِنْ يُرِدْكَ بِخَيْرٍ فَلا رادَّ لِفَضْلِهِ يُصِيبُ بِهِ مَنْ يَشاءُ مِنْ عِبادِهِ وَ هُوَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ) ئەگەر یەزدان ـ زەرەرو زیانی ماڵی یان بەدەنی یان ڕوحی بەسەر تۆدا باراند هیچ بونەوەرێک هێزو توانایی لابردنی نییە وە ئەگەر پێزو بەرەکەت و چاکەی دەگەڵ تۆکرد هیچ بونەوەرێک هێزو توانایی بەرگری و پەرچدانەوەی نییە مسوگەر دەگات بە هەرکەسێ یەزدان فەرمانی لەسەر بێ وە یەزدان خاوەنی لێبوردن و بـەزەیی بێوینەیە) بۆ حاکـمیەت و داوەری یـەزدان ئـایەت زۆرن کـەلەو کتیبەدا جێیان نابیتەوە.

خووای دەکرد. (چوارەم) ئەمیری هەر میللەتێک دەبێ لەخۆیی بێ. (پێنجەم) بۆ ڕێک‌و پێکی و لابردنی دو بەرەکیێ و هاڵوزێ و پەرەپێدانی ئەوین و خۆشەویستی لەنێو کۆمەڵدا. یەزدانی مەزن فەرمویەتی: (فَإِنْ تَنَازَعْتُمْ فِي شَيْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى اللهِ وَ الرَّسُولِ إِنْ كُنْتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللهِ وَ الْيَوْمِ الْآخِرِ. ذٰلِكَ خَيْرٌ وَ أَحْسَنُ تَأْوِيلاً ـ نساء/٥٩) واتە هەر کاتێک نیزاع و دوبەرکی و ناکۆکی لەنێو ئێوەدا پەیدا بۆ، بۆلابردن و توانەوەی بگەڕێنەوە بۆلای خووا ـ واتە پەیرەوی لە قانونی ژین (قورئان) بکەن ئەگەر بەپێی ـ ئایەتی (قورئان) هێزو توانای پێکهاتنی ئەو ناکۆکیە نەبوو ڕێگای پێکهاتنەکە نەدۆزرایەوە. بگەڕێنەوە بۆلای ڕەسولی خووا ـ واتە پەیرەوی لە (حەدیثی) صەحیحی پێغەمبەرﷺ بکەن. (شەشەم) ئەوەیە هێندێک پێویستی ژیان لەنێو ئایەتی (قورئان)دا نادۆزرێنەوە چونکە (قورئان) زۆر پڕمەعناو ناوەڕۆکە زۆر کەس توانایی بۆ چونو حاڵیبونی دناوەڕۆکی ڕاستەقینەی (قورئان)یان نییە جا لەو حاڵەدا ـ دەبێ بگەڕێنەوە بۆلای ـ حەدیسی پێغەمبەرﷺ چونکە زۆر پێویستی ژیان بە حەدیس بەیان کراون. (حەوتەم) یەزدانی مەزن فەرموی (ذٰلِكَ خَيْرٌ وَ أَحْسَنُ تَأْوِيلاً) واتە باشترین و جوانترین شوێن و پەناگا بۆ توانەوەی ناکۆکی وگەیشتن بە ژیانێکی پڕ لە ئاسایش و پیرۆزو ئەوین و خۆشەویستی (قورئانو حەدیسە) و لێرەشدا دەردەکەوێ کە (دین) تەنها قانونێکە ـ کە گیاندار سەر بەرزوو بەختەوەر دەکات لەدنیا و پەسلاندا چونکە ئەگەر سەرنجی ئەو ئایەتە پیرۆزە بدەین و بە تەواوی پەیڕەوی لێ بکرێت ـ واتە پەیرەوی لە (ئەمرو نەهیی خووا و ڕەسولی خووا بکرێت وگوێ بە

فەرمانی ئەمیری واقعی اسلام بدرێت لەچوار چێوەی ژیاندا هیچ تەنگ و چەڵەمەیک ڕو نادات.

بەشی دوهەم یەزدانی مەزن لەقانونی ژیندا (قورئان) بۆ ئەو کەسانە حاکمێت و داوەری پێغەمبەر و جێ گرەکانی ڕاستەقینەی وەرناگرن ـ واتە (پەیرەوی لە قورئان ـ و حەدیسی سەحیح) ناکەن فەرمویەتی (فَلاٰ وَ رَبِّكَ لاٰ يُؤْمِنونَ حَتّٰى يُحَكِّمُوكَ فيما شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لاٰ يَجِدُوا في أَنْفُسِهِمْ حَرَجاً مِمّٰا قَضَيْتَ وَ يُسَلِّمُوا تَسْليماً)

(سورة نساء آية ٦٥) (تفسير طبرى)

لەشی کردنەوەی ئەو ئایەتەدا ـ دەفەرموێ ـ دوبارە کردنەوەی پیتی (لا) کەلە پێش و پاشی (کلیمهٔ رَبِّكَ)دا هاتووە بۆ ئەوەیە بێ بڕوا بون و پەیڕەوی نەکردن لەقانونی دین شێدەتی عەزاب و توندترین سەزای بۆ دیاری کراوە) واتەی ئایەتەکە ناناسوێند بەخوایی تۆ ئەی پێغەمبەرﷺ موسوڵمان و ایماندار نین هەتا کاتێک ئەتۆ بەحاکم‌و داوەری خۆیان قبول نەکەن و لەنیزاع ناکوکێ خۆیاندا حەکەمیێەت و داوەریەکەی تۆ بەگیان‌و دڵ وەرنەگرن و بە ڕاستەقینە پێی ڕازی نەبن وە دوایی ئەوەکە حەکەمیێەت‌و داوەریەکەی تۆیان بە ڕاستەقینە وەرگرت نابینن لە نەفسی خۆیاندا نیگەرانی و نارەزایی و گلەیی لەو داوەرییە، بەڵکو ئەو حەکەمییەتەیان بەدڵ وەرگرتووە و هیچ نارەزایی و شکایەتیشیان لەو حەکەمییەتە نییە ـ جا ئەو آیەتە بە ڕوناکی ڕادەگەیەنی هەرکەسێک پەیڕەوی لە (قورئان و حەدیس) نەکات بە موسوڵمان ناناسرێ سەزای زۆر توندی (جەهەننەم)ی بۆ دیاری کراوە (تفسیری قرطبی لە پێنج بەشدا بەیانێکی زۆری لەسەر ئەو ئایەتە هەیە کە لێرەدا جێی نابێتەوە ج ۶ ص ۴ ـ ۳ ـ ۱۷۳).

## بەشی سێهەم

لە ئایەتی پێشودا پەیڕەوی لە (اوُلِي الأمر) ڕاگەیەندرا (قانونی ژین) (قورئان) ذاتی ـ أولی‌الامر ـ ی دیاری کردوە و دەفەرموێ (إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللهِ أَتْقَاكُمْ ـ الحجرات آیە ١٢ ـ واتە ـ بەرزتر و گەورەتر لەلای خـووا پـاکـترو بـەدین‌تر لە ئـێوەیە ـ هـەرکەسێ زیـیاتر ـ پەیڕەوی لەقانونی دین بکات لەلای خووا خۆشەویست‌ترە ـ واتە (أولی‌الأمر) دەبێ پاکترو بـەدین‌ترینی زەمـانی خـۆیی بـێت ـ وە هەروەها دەفەرموێ: (قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَ الَّذِينَ لاٰ يَعْلَمُونَ) (الزمر آیە ٩)

واتە: ئەی پێغەمبەر ئەتۆ بلێ وەکێکن و موساوین ئەوانـەی کـە زانیاری و پسپۆری تەواویان هـەیە دەگـەڵ ئـەوانـەی کـە نـەزان‌و ناتێگەیشتون ـ ناوەکێک نین جیاوازی زۆریان هەیە ـ لەو ئایەتەش دەردەکەوێ کە (أولی الامر) دەبێ عالم و زاناتری زەمانی خـۆیی بێت لەو بارەدا ئایەت زۆرن کە لێرەدا ناکرێ بەیان بکرێن.

## (بەشی چوارەم)

قانونی ژین (قورئان) وەزیفەو ئەرکی ئەمیرانی ـ ئیسلام دیاری دەکاو دەفـەرموێ (يٰا دٰاوُدُ إِنّٰا جَعَلْنٰاكَ خَلِيفَةً فِي الْأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النّٰاسِ بِالْحَقِّ وَ لاٰ تَتَّبِعِ الْهَوىٰ فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللهِ)(ص٢٦)

واتە: ئەی داود ئێمە ئەتۆن گێڕاوە بە خەلیفە لە ئـەرزێدا ـ واتـە ئەتۆن کردویی بە ئەمیرو سەرپەرستی نەتەوەی (ئـادەمی) لەسـەر ئەرزێ بۆ ئەوەی داوەری و سەرپەرستیان پکەی بە حەق (بەرابەری

و مطابق قانونی خووا) وه شوێن هەواو ئارەزۆری خۆت نەکەوی کە ئەو هەواو ئارەزۆیە ئەتۆ هەڵدێرن لە ڕێگای حەق و خواپەرەستی ـ ئەمیرو أولي الأمریش جێیگری پێغەمبەرانــن و دەبــێ بــەگــوێرەی قانونی خووا دەگەڵ جەماوەری ئی‌نسان بــجولێنەوە قــانونی ژیــن (قورئان) بۆ پێکهینانی کارو ئیشی پێویست دەفەرموێ (وَ شاوِرْهُمْ فِي الأَمر) بیرو ڕاوێژ بکە دەگەڵ جــەماعەتێ کــە لە دەورەی تــۆن تەواوی ئایەتەکە ئەوەیە (فَبِما رَحْمَةٍ مِنَ اللهِ لِنْتَ لَهُمْ (١) وَ لَوْ كُنْتَ فَظاً (٢) غَلِيظَ الْقَلْبِ (٣) لَانْفَضُّوا مِنْ حولِكَ (٤) فاعْفُ عَنْهُمْ (٥) وَ اسْتَغْفِرْ لَهُمْ (٦) وَشاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ (٧) فَإِذا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ على الله (٨) إِنَّ اللهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ.) (آل‌عمران آیه ١٥٩)

واتە: بــەهۆیی ڕوحــمو بــەزەیی خــووا بــوکە پــاکو خــاوێن و دڵنەرمی تۆ ـ بۆ جەماوەی دەورو بەرت (١) ئەگەر ئینسانێکی خوو ڕەوشت ناشرین و خوێن تاڵ بایو (٢) دڵڕەق و توندخۆ بای (٣) ئەو ڕەفیق و جەماوەری دەورو بەرت بەلاوەیان دەکردو لە دەورەت نەدەمان (٤) جا لەبەر ئەوەکە خووای تعالی ئەو چاکەی دەگەڵ تۆ کردووە ئەتۆیی ئاوا پاک و دڵنەرم وەدی هــێناوە بــەبورە و چــاو پۆشییان لێ بکە لەهەر هەڵەو کردەوەیەکی ـ کە پەیوەندی هەیە بــە تۆوە (٥) وە داوای بەخشینیان بۆ بکە لە خووایی کائینات بۆ هەڵەو تاوانێک کە لەبەینی خۆیان و خــوادا کــراوە (٦) وە داوای ڕاوێــژو ڕێنوێنیان لێ بکە لەبارەی هەمو پێویستیەکانی کــۆمەلایەتی‌دا بــۆ ژیانێکی ئارامو پیرۆز (٧) جا پاش ڕاوێژو لێ کۆڵینەوە ئەگەر بیرو ڕاو مسۆگەر بو لەسەر ئەو لایەنەی کە پێویستە (تەوەکوڵ بە خووا) دڵت بەهێز بکە بە گەورەییو بەزەیی خووا ـ لایەنە پێویستە کە پێک

بێنە (٨) بەڕاستی یەزدانی مەزن خۆشیدەوێن ئەو کەسانەی خاوەنی ـ تەوەکولی بەڕاستین (٩) (تفسیر طبری) لەج ٤ آیە ٢ ـ ٢ـ ١٥١

زۆر بە درێژی ئەو آیەتەی شیکردوتەوە کە لەو نوسراوە کورتەدا ـ ناکرێ بەیان بکرێت ـ لەو ئایەتەدا خووای خاوەن بەزەیی چەند فەرمانێک ڕادەگەیەنێ ـ کە پێویستە خووناسەکان پەیڕەوی لێ بکەن ـ (یەکەم) ئەوەیە کە دەبێ بە حەقیقەت بڕوان هەبێ کە خووا ـ خاوەنی ڕەحم و بەزەییەکی زۆرە بۆ عەبدانی خۆیی ـ (دوهەم) دەبێ خۆو ڕەوشت ناشرین و خوێن تال نەبین لەنێو کۆمەڵدا ـ (سێهەم) دەبێ دڵڕەق توندخو نەبین لەنێو کۆمەڵدا ـ (چوارەم) ئەگەر دڵڕەق بەدخو بین کەسن بەدەورەوە نامین و یارمەتی دەرێکن نابێت ـ (پێنجەم) دەبێ لە هەڵەو تاوانی دەورو بەری خۆمان چاوپۆشی بکەین (ئەگەر قانونی دین ڕێگای چاو پۆشیەکەی دابێت) ـ (شەشەم) دەبێ دوعای خێرو داوای لێخۆشبون بکەین بۆ خووناسان ـ (حەوتەم) کارو باری کۆمەڵایەتی دەبێ بەلێ کۆڵینەوەو ڕاوێژی زانایانی خووناس جێ بەجێ بکرێت ـ (هەشتەم) دەبێ بۆ هەمو ڕوداو کارو پێشهاتێک ـ پاڵدەین بە ڕوحم و بەزەیی و گەورەیی خوواو یەقین بە یارمەتی ئەو هەبێ ـ (نوهەم) دەبێ یەقین هەبێ کە خووا خاوەن تەوەککولەکانی خۆش دەوێ ـ ئەگەر بە چاوێکی حەقیقەتبین و بە دڵێکی پیرۆزبو ـ بەنوری یارمەتی خووا تەماشای ئەو ئایەتە بکەین و بە تەواوی بی‌پشکنین زوربەی کاری پیرۆزی و خۆشبەختی جەماوەری تێدایە.

# (بەشی پێنجەم)

قانونی ژین (قورئان) ئەركی پێویستو زەروری جەماوەری نیسبەت بە یەكتری بەیان كردوەو دەفەرموێ: (تَعَاوَنُوا على الْبِرِّ وَ التَّقْوىٰ وَلاَ تَعَاوَنُوا عَلَىٰ الْاِثم وَ الْعُدْوانِ وَ اتَّقُوا الله إِنَّ الله شديد الْعَقَاب) (المائدە آیە ٢)

واتە: (ئەی خوواناسان) (كومەك و پشتیوانی و یارمەتی یەكتری بدەن بۆ چاكەو پەیرەوی لەقانونی خوواو بەجێ هێنانی ئەمری خوواو دوری لە نەهیەكانی خووا وە ٠كۆمەك و یارمەتی یەكتر مەكەن بۆ دوبەرەكی و دوژمنایەتی و جورمو تاوان بترسن لەخووا چونكە بە حەقیقەت خووا توندترین و گەورەترین عەزاب و سەزای داناوە بو نەیارەكان. دیسان قانونی ژین (قورئان) بە ئێمەی راگەیاندووە فەرمویەتی: (إِنَّما الْمؤمِنُونَ إِخْوَةٌ فَأَصْلِحُوا بَيْنَ أَخَوَيْكُمْ وَ اتَّقُوا اللهَ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ) (الحجرات آیة ١٠) واتە بە ڕاستەقینە خووا ناسەكان برای یەكترین نەك برای نەسەبی - (چونكە برای نەسەبی بە جودا بونەوەی دین ڕێبازی ژینی جودا دبێتەوە بەڵام برای دینی لەهەر نژاد و تیرەیەكبێ ڕیبازی ژینەكەیان یەكە واتە برای دینی برای ڕاستەیە) - جا بەهۆیی ئەو برایەتیەو هەر ناكۆكی و دوبەرەكیەك لە نێواندا ڕویدا ئێوە داوەریان لەنێودا پكەنو پێكیان بێنو آشتیان پكەنەوە وە لەو داوەری و پێكهاتنەش‌دا بترسن لە خووا (ڕاستەقینەی عەداڵەت موساوات لەنظر بگرن و زوڵم لەهیچ لایەكیان نەكرێت) (ڕەجا وایە) هیواو چاوەدێرو هەبێ لەلایەن خوواوە ڕوحمو پێ بكرێت وە لەو ئایەشدا دەردەكەوێ كە خووا

ناسەکان دەبێ لە ژیاندا یارمەتی دەری یەکتری بن و بۆ بەرزی و ڕێزو و حورمەتی یەکتری خەبات بکەن ـ قانونی ژین بۆ ئەوانەی کە سەرپێچی دەکەن‌و ڕو وەردەگێڕن لە یاساو قانونی دین واتە فەرمانی خوواو پێغەمبەرو (أولی الأمر) ڕەد دەکەنەوەو دەیخەنە پشت گوێی و لەنیزاع‌و کێشەو دوبەرەکێدا ناگەڕێنە بۆلای خوواو پێغەمبەرو (أولی الأمر) خویان دەفەرمویێت (وَ إِنْ طائِفَتانِ مِنَ اَلْمُؤْمنینَ اِقْتَتَلوُا فَإِنْ بَغَتْ إِحدیٰ هُما عَلیٰ الأُخریٰ فَقاتِلُوا الَّتي تَبْغي حَتیٰ تَفيىءَ اِلیٰ اَمْرِ اللهِ (٢) فَإِنْ فاءَتْ فَاَصْلِحُوا بَینَهُما بِاَلْعَدْلِ وَ أَقْسِطوُا (٣) إِنَّ اللهَ یُحِبُّ اَلْمُقْسِطِینَ (٤)

واتە ـ ئەگەر دو تایفە لە مؤئمینان نیزاع و شەڕو دوبەرەکیان لەنێودا پەیدا بو ـ سوڵحیان لەبەیندا بکەن‌و پێکیان بێنن (١) ئەگەر یەکێکیان سەرپێچی کردو نەگەڕایەوە بۆ لابردنی نیزاعەکەی بۆلای خوواو پێغەمبەرو أولی‌الامر و دەست درێژی دەکرد بۆ سەر ئەویتریان ـ بەربەرەکانی و شەڕی دەگەڵ بکەن هەتا هەڵی دەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوی کردن لەقانونی دین و مل کەچ دەبێ بۆ فەرمانی خوواو پێغەمبەرو ئەمیری موسوڵمانان (٢) ئەگەر وەفای کردو مل کەچ بو ـ بۆ قانونی دین ئێوە سوڵحیان لەنێودا بکەن بە عەداڵەت و حەقی ڕاستەقینە لەبەر چاو بگرن و زوڵم لەهیچ لایەکیان نەکرێت (٣) خووایی بێ‌شەریک خۆشی دەوین ئەو کەسانە کە عەداڵەت و حەقی ڕاستەقینە لەنێو کۆمەڵدا بڵاو دەکەنەوە (۴) تفسیری طبری ج ١٦ ص ٩ ـ ٨ ـ ٢٠٧. لەدە بەشدا بەیانی ئەو ئایەتەی کردوە.

(٢) فاصلحوا بینهما

# بەشی حەوتەم

قانونی ژین (قورئان) شێوەی ژیانی دەگەڵ کۆمەل دیاری کردووە کە ئینسانی موسولمان چۆن بژیت ـ دەفەرموێت وَ لاٰ تُطِعْ مَنْ اَغْفَلْنٰا قَلْبَهُ عَنْ ذِكْرِنا وَ اَتَّبَعَ هَوٰاهُ وَ كٰانَ اَمْرُهُ فُرُطاً. الكهف آیة۲۷. واتە ـ ئەتۆ وە شوێن کەسێک مەکەوە کە لە ئێمە غافڵ کردووە قەلبی چونکە ئەو کەسە وە شوێن هەواو ئارەزویی خۆیی کەوتووە لەرێگای حق و پەیرەوی لەقانونی ژین (قورئان) هەڵە بووە زییادەڕەوی کردووە ـ ئەگەر ئەتۆش وە شوێن ئەو کەسە بکەویت خوو کردەوەی ئەوی فێر دەبێ و لەرێگای حەق هەڵدە دێرێ دیسان دەفەرموێ (وَ لاٰ تُطِيعُوا اَمْرَ الْمُسْرِفِينَ الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِى الْأَرْضِ وَ لاٰ يُصْلِحُونَ) (الشعراء آیة ۱۵۱) واتە ـ ئێوە وە شوێن کەسانێک مەکەون کە موسرفن واتە لە فەرمانی خوواو پێغەمبەر لایان داوەو لە رێگای حەق هەڵدێراون ـ ئەوانە کەسانێکن کە فەسادکارن و ناکۆکی و دوبەرەکی دەچێنن لەنێو ئەرزێ و هیچ چاکەو ئیسلاحێکیان لەنێو کومەڵدا نییە چونکە ئەگەر وەشوێن ئەوانە بکەون بیرو بڕواو کردەوەی ئەوان فێر دەبن و لەرێگای حەق هەڵدە دێرێن ـ دەبێ ئەوەشمان لەبیر نەچێ ئەوانەی دەست بڵاو زییادەڕەوی دەکەن لەماڵو دارائیدا موسریفن هەر ئەوە دەگرێتەوە کە لەحەق لایان داوە.

# (بەشی هەشتەم)
# (ژییانی فەردییە)

ژییانی هەمو فەردێکو هەمو ئینسانێک لەسەر چوار پایە دامەزراوە هەر کام لەو چووارانە لابچێو فڕێدرێت ـ ژییان بەڕوخاوو کاول دەژمێر درێت ئەو چورانە ـ (یەکەم) لەمافی ژییان نەفسی ئینسانە ـکە قانونی ژین (قورئان) پارێزگاری لەنەفس دییاری کردوە ـ دەفەرموێت ـ(وَ لاٰ تَقْتُلوُا النَّفْسَ اَلَّتي حَرَّمَ اللهُ إلاّٰ بِاَلْحَقِّ ـ وَ مَنْ قُتِلَ مَظْلوُماً فَقَدْ جَعَلْنا لِوَلِيِّهِ سُلْطاناً فَلاٰ يُسْرِفْ فِي اَلْقَتْلِ اِنَّهُ كان مَنْصُوراً) (الاسراء ـ آیە ٣٣). واتە ـ ئێوە مەکوژن نەفسێکی ئەو تۆکە خوواکوشتنەکەی حەرام کردبێ بە ناحەق (ئی لاّ نەفسێک کە قانونی ژین (قورئان) فەرمانی کوشتنەکەی دابێت وەکو قاتیلی عەمدی ـکافر لەمەیدانی شەڕێ ـ موسوڵمانی مورتەدو زۆر بەڵگەی دیش هەن بۆ کوشتنێ کە لێرەدا ناکرێ بەیان بکرێن) هەر نەفسێک بە ناحەق بکوژرێت. بەڕاستی دەسەلاّتن داوە بە وەلی ئەو کوژراوە کە قاتیلی بکوژێتەوە بە مەرجێک زییادەڕەوی نەکا لە کوشتنەکەیدا بەڵکو قاتیل بە چەشێوەیە ئەو نەفسەی کوشتوە هەر بەو شێوە دەکوژرێتەوە کوشتنی بە ناحەق بەحەددێک تاوانەکەی گەورەیە کە یەزدانی مەزن لە شەش سورەی قانونی ژین (قورئان)دا مەنعی کوشتنی بە ناحەقی کردوە (القصص / ١٩ ـ النساء ٢٩ ـ المائیدە / ٩٥ ـ الأنعام / ١٥١ ـ یوسف / ١٠ ـ الأسراء ٣٣) کە لەو نوسراوە کورتە ناکری بەیان

بکرێن (دوهەم) ناموسە ـ واتە ژن و منداڵی ئەو ئینسانەیە ـ کە قانونی ژین ڕای گەیاندوەکە بە چاوی خەیانەت تەماشایان نەکرێت و خەیانەتیان پێ نەکرێت ـ وەکو یەزدانی مەزن لەقانونی ژین (قورئان)دا فەرمویەتی ـ یٰاَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا لاٰ تَدْخُلُوا بُیُوتاً غَیْرَ بُیُوتِکُمْ حَتّٰی تَسْتَأْنِسُوا (٢) وَ تُسَلِّمُوا عَلیٰ اَهْلِهٰا ذٰلِکُمْ خَیْرٌ لَکُمْ لَعَلَّکُمْ تَذَکَّرُونَ (۴) واتە ـ ئەی ئەوکەسانەی ئەو تۆ خاوەن ئیمانن داخیل مەبن بۆ ژوری هیچ ماڵێک جودا لەماڵی خۆتان هەتا داوای چونە ژورو دانیشتنەکە نەکەن‌و ڕازی‌بونی بەڕاستی وەرنەگرن (٢) جا ئەگەر ڕەزائیێت وەرگیراو چونە ژور ـ پێویستە سەلام بکەن لە ئەهلی ئەو ماڵە واتە ئەمینەکێ دور لە هەمو خەیانەت‌و فەسادێک نیشانی ئەهلی ئەو ماڵە بدەن (ڕەجاوایە) پێویستە ئێوە بیر بکەنەوە لە گەورەیی و عەزەمەتی خوا و بترسن لە قەهر و غەزبی خوا ـ (٣) دیسان قانونی ژین (قورئان) ڕادەگەیەنێ (فَاِنْ لَمْ تَجِدُوا اَحَداً فَلاٰ تَدْخُلُوهٰا حَتّٰی یُؤْذَنَ لَکُمْ وَ اِنْ قِیلَ لَکُمْ اِرْجِعُوا فَارْجِعُوا + هُوَ اَزْکیٰ لَکُمْ وَاللهُ بِمٰا تَعْمَلُونَ عَلِیمٌ) (النور/٢٨).

واتە ـ ئەگەر بۆلایی ماڵێك چون و خاوەنەکەی لەماڵێ نەبو داخیلی ماڵەکە مەبن و مەچۆنە ژورێ (١) هەتی خاوەنەکەی پەیدا دەبێتەو ئی‌زنو پێدەدا (٢) وەگەر خاوەنەکەی ئی‌زنی پێنەدان وگوتی بگەڕێنەوە ـ فەوری بگەڕێنەوەو ڕامەوەستن (٣) کە ئەو گەڕانەوەیە پیرۆزی و چاکەیە بۆ ئێوە (۴) وە یەقین بزانن خوا ئاگای لەهەمو کردەوەیەکی ئێوە هەیە (٥) ئەو دو ئایەتە ڕادەگەیەنن‌کەنابێ هیچ ئینسانێک بە شێوەیەک کە خاوەن ماڵەکە پێی ناخۆشە، خۆ دەماڵان ڕۆکات‌و خۆ بسەپێنی بەسەر ماڵانداو خۆیو ئەهلی ئەو ماڵە

دوچاری هەڵە و تـاوان بکـات. هـەروەها قـانونی ژیـن (قـورئان) ڕادەگەیەنی ـ کە چاو برکێ و تەماشا (نظر) سـەری هـەمو تـاوان گوناهێکە بۆیە مەنعی هەمو خاوەن ئیمانێکی کـردوە لە تـەماشای نامەحرەم و دەفەرموێت (قُلْ لِلْمُؤْمِنِينَ يَغُضُّوا مِنْ أَبْصَارِهِمْ (١) وَ يَحْفَظُوا فُرُوجَهُمْ (٢) ذٰلِكَ أَزْكىٰ لَهُمْ (٣) إِنَّ اللهَ خَبِيرٌ بِمَا يَصْنَعُونَ (٤) (النّور آیة ٣٠). واتە ـ ئەی پێغەمبەر ئەتۆ بڵێ بـە مـوسوڵمانان لە بەرابەر هەمو نامەحرەمێکدا چـاو داخـەن و تـەماشای نـامەحرەم مەکـەن (١). و هـەروەها بـەپارێزن حـەدەبێ خـۆیان (فـرج) لەوە دەرکەوتن و نیشاندانی نامەحرەمو هەمو جۆرە تاوانێک (زیناکردن) (٢) ئا ئەو چاو داخستن و تەماشا نکردنو دوری لە زیناو تاوان ـ پیرۆزیو خۆشبەختیە لەبۆ ئێوە (٣) بە حەقیقەت خودا ئـاگـادارە بەهەمو کارو کردەویەکی ئێوە (٤) جا ئەو ئایەتە هەروەکـو خـاوە ئیمانەکانی مەنع کـردون لە تـەماشایی نـامەحرەم. فـەرمانی خـۆ پارازتن لە زیناشی ڕاگەیاندوە کە جـرمو تـاوانـی زیـنالەئی قـەتڵ زیاترە چـونکە قـاتیل عـەمدی دەکـوژرێت بـەڵام سـەزای زیـنا موحسەن ڕەجمە کە چاڵێک هەڵدە قەندرێت زیناکەرەکەی دەنێودا وێژرێت بەردباران و سەنگبارانی دەکەن کە زۆر لەکوشتن سوکی و چروکی و بێ‌آبروی تیدایە جالە بەر ئەوەکە زینا توندترین سەزای بۆ دانەراوە و گەورەترین فەسادی تێدایە. قانونی ژین (قورئان) مەنعی هەمو ئینسانیکی کردووە لە (زینا) دەفەرموێت (وَ لاٰ تَقْرَبُ الزِّنىٰ إِنَّهُ كانَ فٰاحِشَةً وَ سٰآءَ سَبِيلاً) (الأسراء آیە / ٣٢). واتە ئێوە نێزیکی زینا مەبن و خۆتان چەپەڵ و پیس مەکەن بە زیناکردن ـ چونکە بە ڕاستی زینا زۆر خەراپە و سوکی و چروکی تێدایەو خـەراپـترین ڕێگـایە

چونکه سەزای زیناکەر ئەگەر گەنجێکبێ ژنی نەهێنابێ و کەچێک میردی نەکردبێ بۆ دفعەی ئەوەڵ هەرکام سەدداری (حەد)یان لێ ئەدرێت و ئەگەر پیاوەکە ژنی هێنابێتو ژنەکە میردی کردبێ سەزایان (ڕجمە) تفسیری قرطبی لەسورة نوردا ـ بەیانێکی زۆری لەسەر زینا هەیە کە بە داخەوە لێرەدا جیی نابێتەوە هەتا ئێرە قانونی ژین (قورئان) بە ئێمەی ڕاگەیاند کە بە سێ شت دەبێ حەیا و ناموسی یەکتر بەپارێزن. (یەکەم) بەبێ ئیجازە و ڕەزایەتی راستەقینە داخیلی ماڵان نەبین (دوهەم) تەماشای نامەحرەم نەکەین. (سێهەم) خۆمان بەپارێزین لە زیناو کاری خەراپ. بەشی (سێهەم) لەمافی ژییان ـ ڕێزو ائیحترام وْ شەخسێیەتی ئینسانە + کە قانونی ژین (قورئان) بە کۆمەلی ئێنسان ڕادەگەیەنێ و دەفەرموێت: (وَ لَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِيٓ ءَادَمَ (١) وَ حَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَ الْبَحْرِ (٢) وَ رَزَقْنَاهُمْ مِنَ الطَّيِّبَاتِ (٣) وَ فَضَّلْنَاهُمْ عَلَىٰ كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً (٤)
(الأسراء آيه ٧٠)

واتە ـ بە ڕاستەقینە ئێمە ـ ڕێزو ائیحترامو بەرزین داوەتە بنی ئادەم (١) و پێویستی سووارین داونەتێ لەوشکی و ئاویدا (٢) و پێ‌ژیوون لە باشترین و پاکترین پێ‌ژیو داونەتێ (٣) وە ڕێزو بەرزین لەهەمو بونەوەرەکانو وەدیهاتوەکانی‌تر ـ زییاتر داونەتێ بەڕێزو گەورەییەکی زۆر (٤) ئەو ئایەتە روناکی پلەو ڕێزو ئیحتیرامی ئینسانی ڕاگەیاندووە ـ کە نەفسی ئینسان لەهەمو بونەوەرێک گەورەترە و بۆ ئەوە نابێ سوکی و چروکی‌یان بەسەردا بڕژێیت هەر بۆیە قانونی ژین (قورئان) بەڕوناکی مەنعی کردووە کە ئینسانێک هۆیی سوک و چروکی ئینسانێکی (براپەکی) خۆیی پێکبێنی ـ وەکو

فەرمویەتی: (يَاأَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لاَ يَسْخَرْ قَوْمٌ مِنَ قومٍ + عَسىٰ أَنْ يَكُونُوا خَيْراً مِنْهُمْ (١) وَ لاَ نِسَاءٌ مِنْ نِسَاءٍ عَسىٰ أَنْ يَكُنَّ خَيْراً مِنْهُنَّ (٢) وَ لاَ تَلْمِزوُا أَنْفُسَكُمْ (٣) وَ لاَ تَنَابَزُوا بِالْأَلْقَابِ (٤) بِأْسَ الاِسْم اَلْفُسُوقُ بَعْدَ اَلْأِيْمَانِ (٥) وَ مَنْ لَمْ يَتُبْ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ (٦) (الحجرات آيه ١١). واتە ـ ئەی ئەو کەسانەی أیمانو هەیە و خوواناسن هیچ (قەوم) تیرەو هۆزێک ئی‌ستیهزاو مەسخەرەو سوکی و چروکی مەڕێژن بەسەر قەومێکی‌تردا زۆر نیزیکە ئەو قەومەی ئەو سوکی و چروکیەی دەخەنە ئەستۆیی لەئێوە چاکتربێت و هیچ کومەڵە ژنێک ئی‌ستیهزاو مەسخەرە نەخاتە ملی کۆمەڵە ژنێکی‌تر زۆر نێزیکە ئەوانەی مەسخەرەیان پێ دەکرێت باشتربن لەوانەی کە مەسخەرە دەکەن (ئەوشمان لەبیر نەچێت کە نیساء موفرەدە بەڵام لەمەعنای جەمعی‌دایە ـ واتە ـ هیچ کۆمەڵە ژنێک مەسخەرە نەکەن بە کۆمەڵە ژنێکی‌تر (٢). نەفسی خۆتان عەیب‌دارو ناشیرین مەکەن تەفسیری طبری لەو آیەتەدا ئاوای بەیان کردووە ـ بەدەست‌و چاوو زوبان و حەرەکاتی سەیرو پێکەنین هێنەر وەکو لۆتی چەقۆ + شانۆگەر ـ کۆمەڵێک سەرخۆش‌و وەپێکەنین دەخەن‌و لەفکرو بیری خوواو دین وە دوور دەکەون) کە ئەوە لەڕوانگەی قانونی ژین (قورئان)دا بەعەیب‌و سوکایەتیکی زۆر حیساب کراوە (٣) ئەو نێوانە کە سوکی و چروکی دەگەیەنن بۆ یەکتریان مەهاوێن و بەمل یەکتریان دامەبڕن کە ڕوحی ئەو نێو بەسەردا بڕاوە بکەوێتە عەزاب و لەڕێزو ئیحتیرامی ئەوی کەم بێتەوە کە غەیبەت و بوهتانیش هەر لەبەر ئەوەیە خووا نەهی لێ کردوون کە لە ڕێزو ئیحتیرامی ئەو شەخسە کەم دەبێتەوە بەڵام نێوێک کە لەنێو کۆمەڵدا بەڵاو بوتەوەو

بەزۆری هەر بەو نێوە دەناسرێو ڕوحی ناو براوە کەشن ناکـەوێتە ئازارو عەزاب مەنع نییە) لە تـفسیری قـرطبی ج ۶ لەبـەیانی ئـەو ئایەتەدا نەزەرات زۆرن بەلاّم بە گوێرەی حەدیسە نەقڵ کراوەکان ـ ئەلقاب لێرەدا بە نـیوێک دەڵـێن سـوکایەتی و چـروکی تـیدابـێ و ناوبراوە کە پێی بکەوێتە عەزابەوە (۴) ئەو نیوانە کە گـوناەو تـاوان دەگەیەنن دووای ئەوە کە بونەتە مؤمین و خـووانـاس پـیسترین و خەراپتر نێون و بانگی یەکتریان مـەکـەن (۵) هـەر کـەسێک یـان کۆمەڵێک لە بەکارهێنانی ئەو و نێوە ئـازار دەرانـە تـوبە نـەکـاتو نەگەڕێتەوە بۆ پەیڕەوی لە قانونی ژین (قورئان) بە زاڵم دەژمێر درێ و سەزای زاڵمانێش زۆر توندە (۶).

## (بەشی چوارەم لەمافی ژییان ـ ماڵەو ملکە)

قانونی ژیان (قورئان) ڕایگەیاندووە کە هییچ ئینسانێک حەقی نییە ماڵی هییچ ئینسانێک بە فیڕوو بەخۆرایی بخوات فەرمانی داوە بە خاوەن ماڵ بە تایبەتی فەرمویەتی (وَ لا تُؤْتُوا اَلسُّفَهاءَ آمْوالَكُمْ اَلَّتي جَعَلَ اللهُ لَكُمْ قِياماً) (النساء آیه ٥). واتە ماڵێک کە خوواکردویەتە هۆیی ژییان و بژیوی ئیوە مـەیدەن بـە ئـەو کـەسانە کـە سـەفین و جییاوازی ناکەن لەبەینی چاکەو خەراپە و خـێرو شـەڕا. (تـفسیری طبری) لەبەیانی ئەو ئایەتەدا سەفی بەزۆر واتە بەیان کردوە کە هەتیو و شێت و مەحجور و نەزان لەچۆنیەتی بازارشی تیدایە بـەلاّم ئـەو ئایەتە ئەوەش دەگەیەنێ کـە ئـینسانێک دارایـی خـۆیی لەڕێگـای نامەشروعەوە خەرج دەکات ئەگەر کەسێک مـاڵی خـویی بـداتـی تاوانکارە هاوبەشی تاوانی ئەوکەسەیە خۆ سەفی‌هەکانیش دروست

نییە لەبرسان و لەڕوت قوتی بمرن جا قلۆنی دین بەشی ئەوانیشی دیاری کردوە و فەرمویەتی (وَ اَرْزُقوُهُمْ فيِهٰا وَ اَكْسوُهُمْ وَ قُولُوا لَهُمْ قَوْلاً مَعْروُفاً) (النساء آیه ٥) واتە ئێوە بژیو و لیباس بدەن بەو سەفیهانە بە گوێرەی پێویست و بەزوبانی شیرین و دڵ خوشکەر دەگەڵیان بدوین و نارەحەتیان مەکەن + هەروەها بەشێوەی تێکرایی رای‌گەیاندووەو فەرمویەتی: البقره: ١٨٨ + (يٰـاَيُّهٰا الَّـذين اٰمَـنُوا لاٰ تَأْكُلُوآ أَمْوالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِاَبٰطِلِ (١) اِلاَّ أَنْ تَكوُنَ تِجٰارَةً عَنْ تَرٰاضٍ مِنْكُمْ (٢) وَ لاٰ تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ (٣) اِنَّ اللهَ كٰانَ بِكُمْ رَحيِماً (۴) واتە ئەی ئەو کەسانەی ئەو تۆ خاوەنی ئیمان و خوواناسن ماڵی یەکتر بە ناحەق و بەفیڕۆ مەخۆن لەمابەینی خۆتاندا (١) مەگەر وەختێکی لەبەینی خۆتاندا موعامله و تیجارەتێکی دروست‌و بەرابەر دەگەڵ قانونی معاملەی دینی‌دا بکەن (٢) وە ئێوە یەکتر مەکوژن لەسەر ماڵی دنیایە (٣) بە ڕاستەقینە خووا روحم و بەزەییەکی زۆری دەگەڵ ئێوە کردووە (۴) ئەو ئایەتە بە ڕوناکی ڕادەگەیەنی کە هیچ کەس حەقی نییە ماڵی هیبچ‌کەس بە ناحەق بخوات و داگیر بکات + قانونی ژین (قورئان) رای‌گەیاندووە کە ئەو کەسانە کە بە هۆی دەسەڵات ماڵی خەڵکی دادەگرن‌و زوڵم لەبێ هێزو بێکەسەکان دەکەن و فەرمویەتی: سوره ابراهیم: ٤٢ (وَ لاٰ تَحْسَبَنَّ اللهَ غٰافِلاً عَمّٰا يَعْمَلُ الظّٰالِموُنَ + اِنَّمٰا يُؤَخِّرُهُمْ لِيَوْمٍ تَشْخَصُ فيِهِ اْلأَبْصٰارُ) واتە با فکر نەکەنەوە کە خووا بێ ئاگایە لەکارو کردەی جورم‌و تاوانی ئەو زاڵمانە ـ بەڵکو سەزای کردەوەی ئەوانە دوادەخراوە بۆ ڕۆژێکی هەمو چاوێک بەڕوناکی سەزای کردەوەکەیان ببینێت ـ ئەو ئایەتە بۆ دڵدانەوەو خۆ ڕاگرتنی پیغەمبەر ﷺ لەبەرابەر کافرەکانی دەورانی ـ هاتووە کە خووا

هەرەشەی زۆر توندی لەکافرەکان (واتە زاڵمەکان) دیاری کردووە ـ زاڵم بە تێکرایی چەندڵکی هەیە (یەکەم) ـ داگیرکردنی ماڵ ـ (دوهەم) ئازاردانی گیاندار بە ناحەق ـ (سێهەم) خەیانەت و تەجاوزە بە ناموسی خەڵق بە پێچەوانەی دین (چوارەم) ماڵی زۆری هەیەو حەقی زەکاتی لی نادات (پێنجەم) ماڵی زۆری هەیەو لەرێگای نامشروعدا خەرجی دەکات و...)

هەر بۆیە یەزدانی مەزن فەرمویەتی: (وَ ٱلْكَافِرُونَ هُمُ الظَّالِمُونَ) (بقره / ٢٥٤). واتە کافرەکان بە راستەقینە زاڵمن ـ هەروەها ـ قانونی ژین (قورئان) فەرمویەتی (بَلِ الظَّالِمُونَ فِي ضَلَالٍ مُبِينٍ) (لقمان/١١) واتە بەڵکو زاڵمەکان لە گومڕاهی و سەر شێواویەکی ئاشکرادان و رێگای حەقیان لێ ون بووە ـ قانونی ژین (قورئان) رای گەیاندووە کە هیچ ئینسانێک ماڵی هیچ ئینسانێک نەدزی و مەنعی پیشەی دزی راگەیاندووە. فەرمویەتی (وَ السَّارِقُ وَ السَّارِقَةُ فَاقْطَعُوا أَيْدِيَهُمَا ـ جَزَاءً بِمَا كَسَبَا نَكَالاً مِنَ اللهِ. وَ اللهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ) (المائدە / ٣٨) واتە پیاوی دزو ژنی دز ـ هەرکاتێک دزیان کرد هەر دوک واتە پیاو ژن دەستیان قەتع کەن لەتۆڵەی ئەو پیشە خراپەی کردویانە ـ کە سەرپێچیان کردووە لە ئەمری خودا ـ کە بە راستی خودایەکی دەسەڵاتدارە بەسەر هەمو شتێکدا و هەمو کردەوەشی لەشوێنی خۆی دایە ـ ئەو ئایەتەش بەرونای رای گەیاندوە خەیانەت بەماڵی کەس نەکرێت (قانونی ژین) (قورئان) حەقی بە هەمو ئینسانێک داوە کە بە هەمو هێزو توانایی خۆیی دیفاع لەگیان و ماڵی خۆیی بکات و رێزو حەیسییەتی خۆی بە پارێزی و فەرمویەتی (فَمَنْ أَعْتَدىٰ عَلَيْكُمْ فَاعْتَدُوا عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا إِعْتَدىٰ عَلَيْكُمْ ـ وَ اتَّقُوا الله

إِنَّ مَــعَ الْــمُتَّقِينَ) (بـقرة / ١٩٤) واتـه هـەر کـەسێک دوژمـنی و دەستدرێژی کردە سەر ئێوە + ئێوەش دوژمنی وەدەست درێژیان پکەنە سەرو بەرگیان لێ بکەن ـ بەو ئەندازەی کـە ئـەوان دوژمـنی ودەست درێژی دەکەن ـ و بترسن لەخووا ـ و یەقین بزانن کە بەڕاستی خووا دەگەڵ ئەوکەسانەیەکە بە ڕاستی پەیرەوی لەخووا دەکەن ـ ئەو ئایەتەش روناکە لەوەدا کە هەمو کەس حەق و مالی هەیە بـەرگری لەگیان و ماڵ و ناموس و ڕێزو خەیسییەتی خۆی بکات هەتا ئێرە ژیانی فەردی بەهەر چوار کۆڵەکەوە نـناسی کـە یـەزدانـی وەدی هێنەری بـونەوەر لە قـانونی ژیـن (قـانونی دیـن)دا بـە ئـینسان و ئەجیینەی ڕاگەیاندوە جا ئەگەر ئێمە (نەتەوەی ئادەمی) بە چاوێکی عادلانەوە بەدڵێکی خاوێن سەرنجی بدەین و بیری لێ پکەینەوە + خەیانەت ـ بەگییان و ناموس و ڕێزو حورمەت و ماڵی یەکتر نەکەین ـ هیچ شەرو کوشت و کوشتارو نیزاع دو بەرەکـێ و دڵ ئـازاریـەک ڕونادات واتەی دیموکراسی ڕاستەقینەش ئەوەیەکە لە زەمانی (عمر بن عبدالعزیز)دا پەرەی گرتبو.

## (بەشی نۆهەم)

## پیکهاتنی ماڵە (تشکیل خانوادە)

قانونی ژین (قورئان) ڕای گەیاندووە ـ (وَ اِنْ خِفْتُمْ اَلاَّ تُقْسِطُوا فِي الْيَتامىٰ + فَانْكِحُوا ما طابَ لَكُمْ ـ مِنَ النِّساءِ مَثْنىٰ وَ ثُلٰثَ وَ رُباعَ + فَاِنْ خِفْتُمْ اَلاَّ تَعْدِلُوا فَواحِدَةً + اَوْ ما مَلَكَتْ اَيْـمانُكُمْ ـ ذٰلِكَ اَدْنىٰ اَلاَّ تَعوُلُوا) (النساء ـ ٣) (واتە ـ ئەگەر ئێوە ترس و هـەبو

ڕاستەقینەی عەداڵەت و بۆ ناکرێ دەگەڵ هەتیوان ئەگەر مارەیان بکەن دووای بلوغیان) (ئێوە مارە بکەن ـ لەو ژنانە (کە بە پێی قانونی دین) خاوێن و پاکن لەبۆ ئێوە یەک ـ یان دو ـ یان سێ ـ یان چوار ژن + و ئەگەر ترسێ ئەوەو هەبو ـ ناتوانن کە بە عەداڵەتیان ڕابگرن‌و وەکێکیان لەهەمو بارێکە دەگەڵ بژین ـ یەک ژن مارە بکەن ـ یان جاریەکی مارە بکەن کە مڵکی خۆتانبێ). کە مڵکی خۆتان بێ ئا ئەو یاسایە کە بە ئێوە ڕاگەیاندرا. ئاسانترین ڕێگایە و لیێ لامەدەن و پەیڕەوی لێ بکەن ئەو ئایەتە لە (تفسیرکاندا) بەیاناتی زۆرە کەلەو نوسراوە کورتەدا ناکرێ بەیان بکرێت + بەشی هەوەڵی کە فەرمویەتی وَ إِنْ خِفْتُمْ اَلاَّ تَقْسِطُوا فِي اَلْيَتَامىٰ ـ بە کورتی وەکو ئەوەیە پیاوێک مامێکی هەیەو ماڵی زۆرەو دەمرێ و تەنیا کچێکی چوکەڵەی واریسەو زوربەی میراتەکە بۆ ئەوکچە چوکەیەو ئەو پیاوە تەنها وەلی ئەوکچەیەو بەخێوی دەکاو ئەگەر بلوغی بو مارەی بکات بەڵام دەترسێ ماڵ و میراتی ئەوکچە بخوات و تاوانبار بێت لەو حاڵەدا با ئەوکچە مارە نەکات هەروەهایە پورزاو خاڵۆزاش بەڵکو فَانْكِحوا هەتا آخیری بەیان کراوە کە دیسان پیاوە ـ ئەگەر ژنی هێناو دەگەڵ ئەو ژنە ژیانیان پێکە نەدەگونجا. قانونی ژین ڕێگا بۆ دیاری کردون و فەرمویەتی (وَ إِنْ خِفْتُمْ شِقَاقَ بَيْنِهِمَا فَابْعَثُوا حَكَماً مِنْ اَهْلِهِ وَ حَكَماً مِنْ اَهْلِهَا + إِنْ يُرِيدآ إِصْلاَحاً يُوَفِقِ اللهُ بَيْنَهُمَا + إِنَّ اللهَ كَانَ عَلِيماً خَبِيراً) (النساء / ٣٥) واتە ئەگەر ترس‌و هەبو ـ لە جودا بونەو ناکۆکی و بەربەرەکانی ژن و مێرد داوەرێک لەخزمی ژن و داوەرێک لەخزمی مێرد بنێرن بۆلایان + ئەگەر ئەو ژن و مێردو و داوەرانە بڕیاریان لەسەر یەکگرتنەوەو ئاشتی و پێکەوە ژیان بو ـ

ئەوە ـ یەزدانی مەزن بەڕوحمی خۆیی یارمەتیان دەداو ژیان دەبەنە سەر + بەڕاستەقینە خووا زانایەو ئاگادارە بەهەمو شتێک ئەگەر نەدەکراو ایمکان نەبو ئەو ژن و مێردە پێکەوە بژین خووا ڕێگای جودابونەوەی ڕاگەیاندووە ـبە خواردنی ـ (طلاق) و فەرمویەتی (وَإِنْ عَزَمُوا الطَّلَاقَ فَإِنَّ اللهَ سَمِيعٌ عَلِيمٌ) (البقرة ـ ٢٢٧)

واتە ئەگەر ـ ژن و میرد بڕیاری جودابونەوەیاندا ـ با بە خواردن و بەیانکردنی (طلاق) لێک جودا ببنەوەو خووا دەبیستێی‌و زانایە بە هەموکردەوەیەک (واتە طلاق) خواردن و طلاق‌دانەکە دەبێ بەرابەر بێ بە قانونی دین و عەدالەتی تێدا وە بەرچاو بگرێت‌و مافی هیچ‌یەک بەفیڕو نەچێ کە لەبارەی طلاق‌دا لە دوازدە شوێنی قانونی ژین (قورئان)دا بەیان کراوە (بقرة ـ+ ٢٢٧ ـ ٢٢٩ ـ ٢٣٢ـ ٢٣٢ـ ٢٣٦ ٢ـ الطلاق یک ـ بقرة / ٢٣٧ الأحزاب / ٤٩ التحریم / ٥ البقرة / ٢٣٠ ـ ٢٣٠ ٢ الطلاق یک) کە لەو نوسراوە کورتەدا ناکرێ بەیان بکرێن. قانونی ژین (قورئان) ڕای گەیاندوە کە ئەرکی بەخێوکردن‌و بارهێنانی منداڵ بە ئەستۆیی دایک و بابە و دەبێ بەهەمو توانایی خۆیان منداڵ گەورە بکەن بە پێی داب و دەستوری نیشتمانەکەیان فیرێ خوێندون زانیاریان بکەن ـ فەرمویەتی (وَ لاٰ تَقْتُلوا اَوْلاٰدَكُمْ خَشْيَةَ إِمْلاٰق + نَحْنُ نَرْزُقُهُمْ وَ إِيّٰاكُمْ ـ إِنَّ قَتْلَهُمْ ـ كٰانَ خِطْاٰءً كبيراً) (الأسراء / ٣١) واتە ئێوە مەکوژن أولادی خۆتان لەترسی نەفەقەو بژیو (وا بیر بکەنەوە ئێمە فەقیرین و ئەو منداڵەن بۆ بەخێو نابێت و بیکوژن) ـ ئێمە نەفەقەو بژێو دەدەین بەوان و بە ئیوەش + بەڕاستی کوشتنی ئەولاد تاوانێکی زۆر گەورەیە + جا مادام خووا ڕازیق و بژیودەری گەورەوبچوکە واجبە لەسەر دایک‌و باب زۆر موحتەڕەمانە و بەڕیز منداڵەکەیان گەورە بکەن‌و

فێری خوێندنو زانیاریان پکەن.

## (بەشی دەیەم یارمەتی دینە)

قانون ژین (قورئان) رای گەیاندووەو فەرمویەتی (کُنتُمْ خَیْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاس - تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَ تَنْهَوْنَ عَنِ = اَلْـمُنْکَرِ وَ تؤمِنُونَ بِاللّهِ) (آل‌عمران / ١١٠) واتە ئێوە باشترین و چاکترین اُومّتیکن کە وەدی هاتون لە نەتەوەی ئادەمی- + ئەمر دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خەراپەو ئیمان و باوەڕتان و هەیە بەخووا + لەو ئـایەتەدا بەڵگەی چاکیەتی ئوممەتی پێغەمبەری ﷺ کردە: ئەوەکە ئەمر دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خەراپەو ئیمانیان بە خـووا هـەیە - واتـە یەکێک لەو سێیانە (١) ئەمر بە چاکە (٢) نەهی لە خەراپـە (٣) ئیمانو باوەری بەخووا ئەگەر بفەوتی دەگەڵ توواناییی ئـەو رێـزو بەرزییەتی نابێ + دیسان فەرمویەتی (وَلْتکُنْ مِنکُمْ أُمَّةٌ یَـدْعوُنَ إِلىٰ اَلْخَیْرِ + وَ یَأْمُرُونَ بِاَلْمَعْرُوفِ وَ یَـنْهَوْن عَـنِ الْـمُنْکَرِ + وَ أُولَئِكَ هُمُ اَلْمُفْلِحوُنَ + وَ لاٰ تَکوُنوُا کَالَّذِینَ تَفَرَّقُوا وَ اَخْتَلَفُوا مِنَ بَعْدِمٰا جٰاءَهُمُ اَلْبَیِّنٰاتِ وَاوُلٰئِكَ لَهُمْ عَذابٌ عَظِیمٌ) (آل‌عمران-١٠٤/١٠٥)

واتــە - مســوگەر دەبـێ لەئـێوە (ئـەی جـەماعەتی ئـیماندار) اُوممەتێک - بانگی خەڵکی دەکەن بۆ خوواناسی و کاری خـێر وە ئەمر دەکەن بە چاکەو نەهی دەکەن لە خەراپە + ئەوانـە بـەراسـتی رەزگارو سەرکەوتن + ئێوە وەکو ئەو کەسانە مەبن کەلێک دەپچرێنن کۆمەڵ و دوربەرەکێ و ناکۆکی دەخەنە نێوان دووای ئەوەی (قانونی ژین) (قورئان)یان پێ راگە یاندون و هەمو رێگـای چـاکـەو خەراپەیان بۆ بەیان کراوە + لەبۆ ئەوانە دییاری کراوە عەزابێکی زۆر

گەورە لێرەشدا دەردەکەوێ کە أومەتی پێغەمبەر ﷺ کاتێک باشترین أومەتەکە ئەو سێ مرجانەی تێدا هەبن (یەکەم) ئیمان بە خواو رەسول (دوهەم) ئەمریبکات بە چاکە (سێهەم) نەهی بکات لە خەراپە واتە ئەرکی هەمو موسوڵمانێکە بەپێی توانایی خۆیی بۆ بەرزکردنەوەو پەرەپێدانی دین حەوڵی بدات و خەبات بکات و بەرگری بکات لەوشتانەکە خووا نەهی لێ کردون و دەبنە هوی کزی و لاوازی دین.

## (بەشی یازدەهەم
## ژیان دەگەڵ ئەوانەکە دێنی ئیسلامیان قبول نییە وکافرن)

قانونی ژین (قورئان) ژیان دەگەل ناموسوڵمانەکانیشی دیاری کردووە فەرمویەتی (لاٰ تُجٰادِلُوا اَهْلَ الْكِتٰابِ إِلاّٰ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ) (عنکبوت / ٤٦)

واتە ئەی پێغەمبەر ﷺ ئەتۆ بەحس و موجادەلە مەکە دەگەڵ ئەهلی کیتاب (یەهودی و نەسرانی) مەگەر بە شێوەیەکی زۆر جووان و شیرین. ئەو ئایە وا نیشان دەدات کە ژیان دەگەڵ کافرانیش پێویستە بە شێوەیەکی شیرین و جوان بێت بۆ ئەوە کە دڵیان ڕاکێشی بۆلای کۆمەڵی ئیسلام و خووناسی. دیسان قانونی ژین (قورئان) ڕوناکتر لەوە فەرمویەتی (وَ لاٰ تَسُبُّوا الَّذِينَ يَدْعُونَ مِنْ دُونِ اللهِ + فَيَسُبُّوا اللهَ عَدْواً بِغَيْرِ عِلْمٍ + كَذٰالِكَ زَيَّنّٰا لِكُلِّ أُمَّةٍ عَمَلَهُمْ ثُمَّ إِلىٰ رَبِّهِمْ مَرْجِعُهُمْ فَيُنَبِّأُهُمْ بِمٰا كٰانُوا يَعْمَلُونَ) (أنعام / ١٠٨)

واته + ئێوه (ئەی میللەتی موسوڵمان) جۆین و وتاری ناشیرین مەدەن بە ئەو کەسانە کە هاوار دەکەن بو غەیری خوواو دەیپرستن (کافرەکان) کە بەهوی ئەو جوێن و وتارە ناشیرنانەی ئیوە ـ خووا نەناسەکانیش جۆین و وتاری ناشیرین بەخووا بڵێن کە بەهوی جاهیلی و نەزانیەوە بەربەرەکانی و دوژمنایەتی دەکەن دەگەڵ خووا ناسەکان هەروەهایە (فەرمانی خووا) لەبۆ هەمو اومّەتێک رازاندونەتەوەو سازنکردوە کردەوەیی لە تەواوی ژیانەکەیدا + مسوگەرە هەر بۆلای ئێمە دەگەڕێنەوەو زۆر بە ڕوناکی ئاگادار دەکرێنە لەسەر کردەوەکەیان (و سەزای کردەوەکەیان وەردەگرنەوە) تفسیری قرطبی ج ۷ ص ۴۱ فەرمویەتی ئەو ئآیەتە لەبارەی پێغەمبەر ﷺ کافرەکاندا وارد بووە بەڵام حوکمەکەی هەمیشەیەو بۆ گشتیە واتە خووا ناسەکان کە جۆین بە کافرەکان بدەن دەبنە هۆیی ئەوە کە کافرەکانیش جوێن بە خووا بەدەن و تاوانێکی گەورەیە ئەو بریارەی قانونی ژین (قورئان) لە کاتێکدایە کە خووا نەناسەکان بەهانەگیرو دەستدرێژی نەکەنە سەر خووناسەکان جا ئەگەر بەهانەگیر بون و فێڵو تەڵەکەیان وەدی هێناو دەستدرێژیان کرد هەروەکو لەپێشەو بەیان کرا قانونی ژین (قورئان) فەرمویەتی: (وَ قَاتِلُوا فِي سَبِيلِ اللهِ وَ اَعْلَمُوا إِنَّ اللهَ سَمِيعٌ وَ عليم) (البقرة / ٢٤٤). واتە ـ ئێوە شەڕێ بکەن بۆ ڕەزائییەتی خووا ـ (واتە لەڕێگای سەرکەوتنی دینی ئیسلام و پەیرەوی لە قانونی ژین (قورئان) وە بە ڕاستەقینە بزانن یەزدانی مەزن دەبیستێ و دەبینێ هەمو کارو کردەوەی هەمو بونەوەرێک. دیسان قانونی ژین (قورئان) فەرمویەتی (اَلَّذِينَ يُوفُونَ بِعَهْدِ اللهِ وَ لاَ يَنقُضُونَ المِيثَاقَ... أُولَئِكَ لَهُمْ عُقْبَى اَلدَّارِ) (الرعد آيه ٢٠ الى٢٣)

سورەتی الرّعد ئایەتـی / ٢٠ الي ٢٣) واتـە: ئـە وانـەی ئـەو تۆکە وەفا دەکەن و و پێکوێینن بەڵـین و پـەیمـانی خـوا = هەڵنا وەشێننەوە بەڵێن و پـەیمانێـک کـە بـەسـتویانە ئـەوانـە خانوی ئاخیرەت (بەهەشت) بۆیان دیاری کراوە جا ئـەگـەر وەفابەبەڵێن و پەیمان دەگەڵ وەدی هێنەر (یەزدانی مەزن) هـۆی چوونـە بـەهـەشـتبی دەگـەڵ بونـەوەرەکـانیش ئـەو خەلآتەی هەر هەیە چوونکـە پـەیمـان شـکێنی و وەعـدە بـە خیلافی تاوانێکی گەورەیە لە قانونی دیندا بـراو خوشـکانی بەڕێز هەتا ئێرە لە هەمو بووارەکانی پێویستی ژیاندا لە هـەر بەشەی دەنکێک لە خەڵواریک نیشانم داوە وە یەقین بـزانن هەر دەنکە لە هەر بەشێکدا کە وە بەرچاو دراوە دەنکێکە لە خەڵواریک لـە ئایـات و حـەدیـث و فـەرمـودەی زانیـارانی دینی، بە هێوای ئـەوە کـە لـەو دەنکـە وە بـڕۆن و بگـەن بـە خەلوارەکە و بە پشکێنی خەڵوارەکە بە ڕاستەقینە بگەنە ئـەو حەقیقەتەکە تەنها قانونێک کە ئاسایش و بەختەوەری و ڕێز

و سەربەرزی دنیا و پەسلانی تێدا بێت (قانونی دینە) وە هەر ئەو قانونی دین بەرنامەی ژیان بۆ هەموو بوونەوەریک و لە هەمو زەمانێکدا دیاری کردووە کە (خالیق و مالیک و حاکم)ی هەموو بوونەوەریک (یەزدانی مەزن) ئەو قانونەی بۆ هەمو بونەوەرەکانی خۆی داناوە کە لە سەرەتای ژین هەتا برانەوەی ژین وەری بگرن پەیرەوی لێ بکە جا هیوام وایە ئەیۆەش کەڵکی لێ وەر بگرن.

ئیتر بە خوواو دسپێرم = درود و سەڵاوی شیاو لە سەر پێغەمبەر و پەیرەوانی بە ماوەی بوون و ژیان

١٣٧٦/٢/١٤ شمسی ٢٦ ذی‌حجەی هجری ١٤١٧

رسول عطوفی

## ناوەرۆک

# (فەلسەفەی دین)

دانەراوی رسول عطوفی=پێشاسپی

بریاجی دانیشتوی

سردشت

«بِسْمِ اللهِ الرَّحْمٰنِ الرَّحیمِ وبه نَسْتَعِین»

(الحمدلله ربّ العالمین و الصّلوة و السّلام علیٰ خیر خلقه محمد و اله و اصحابه الطّاهرین الی یوم الدّین)

(به ناوی یەزدانی بژیودەرو خاوەن بەزەیی) تکای یارمەتی هەر لەوی دەکەم)

درود و سلاّوی پاک و شیاو و بوگییانی پاک و پیرۆزی سەرداری پێغەمبەران حەزرەتی موحەممەدﷺ و پەیرەوانی بە ماوەی بون و ژییان)

براو خوشکانی بە شەرەفی کورد تایبەت و ئینسانە بەرێزەکانی دنیای پێشکەوتوی ئەورۆ بە تێکرای. هەر وەکو کتێبێکم نوسیوە بە ناوی (دین قانونی ژینە) بە یارمەتی یەزدانی مەزن. کتێبێکیش دەنوسم بە ناوی (فەلسەفەی دین) زۆر بە کورتی دەیخەمە بەرچاوان و ڕای دەگەیەنم کە دین قازانج و سودو بەرهەمی بۆ، خووایە، یان بۆ ئەوکەسانەیە کە دین بەرێوە دەبەن و بە تەواوی پەیڕەوی لێ دەکەن سەرەتا چاوپۆشی لە بەڵگەو دلیلی نەقڵی واتە (آیتە و حدیث) و نەزەری زانایان دەکەین و دەگەرێنەوە بۆلای ویژدان و عەقڵی سلیمی ئینسانی، جا ئەگەر ئێمە بە تەواوی بیر بکەینەوەو زۆر بە وردی سەرنجی ئەو دنیا سەرسوڕهێنەرە بدەین بۆمان ڕون دەبێتەوە کە ئینسان (بنی ئادەمی) لە نێو هەمو بونەراندا جودا بۆتەوە و ڕازاوەتەوە بە فەیزو بەرەکەتی عەقڵ و زانیاری و ڕێزو شەرەفی نوتق (نطق) و بەیان و باقی بونەوەر (جودا، لە فریشتەو ئەجیننە)

هەمویان لەوانە بێبەش و دورن، جا پێویستە زۆر بە وردی سەرنج بدەین و فکر بکەینەوە کە بەڵگەو دلیل ئەوە کە ئینسان ئەو پیرۆزیانەی هەیە و باقی بونەوەر (جودا لە فریشتەو ئەجیننە) بێبەشن، ئەوەیە کە ئینسان خاوەنی قانون و یاسایە کە ویەیڕەوی لە قانونێک دەکات، کە حەیواناتی‌تر لەو قانونە بێبەشن و پەیرەوی لێ ناکەن وە ئەو قانون و یاسایەش قانونی (دینە)، و تەنها قانونی دینە کە عیززەت و شەرافەت بەرزی و پیرۆزی دەپارێزیو سەددێکی پولاینە کە ئینسان دور دەخاتەوە لە هەموو سوکی و چروکی ڕەزالەت و کەسافەتی ژین، جالە کتێبیکدا بە ناوی «دین قانونی ژینە» ئەو پرسیارەرانەم ڕوون کردونەتەوە کە ١ـ (دین) چییە ٢ـ دەبێ کێ دین دابنێ. (یەزدانی مەزن) ٣ـ یەزدان چۆن بناسین ٤ـبۆ دەبێ قانون دین هەر یەزدانی مەزن دایبنێ و ناکرێ یەک نەفەر زانا، یان چەند زانیار و فیلسوف قانونی ژین کە لە سەرەتای دنیایە ڕاهەتا برانەوەی دنیایە بۆ هەمو زەمانێک و بۆ هەمو فەردێک لە ئەفرادی ئینسان بە کەڵک بێت دابنێن، ئەو پرسیارانە هەر یەکەی لە شوێنی خوێدا ڕاگەیەندراون و پێویست نییە لێ ڕەدا دوبارەیان بکەم وە، بەڵکو لەو کتیبەدا مەبەست ئەوەیە کە (دین) قانونی ژین قازانجی چییە و بۆ کێ پێویستە، دین قانونێکە کە لە بەوجود هاتنی حەزرەتی (ئادەم) هەتاکاتی حەزرەتی موحەممەدﷺ جارێک بەناوی) (سحوف) جارێک بەناوی (تەورات) جارێک بەناوی کتیبێکی تایبەتی حەزرەتی داود بووە (زەبور و تەورات، قانونی دینی نەبووە بەڵکو) پێویستە ئەوەش بزانین کە زەبور

جاریک بەناوی (أنجیل و لە ئاخردا بەناوی (قورپان) یەزدانی مەزن ڕای گەیاندووە کە عەبدو بەندە کانی خووا بە پێی ئەو قانونە بژین وە ئەوەی بە تەواوی پەیرەوی لەو قانونە بکات خووا بەهەشتی بۆ داناوە و ئەوەی مل بادات و پەیرەوی لێ نە کات خووا جەهەننمی بۆ داناوە ـ ئەو بەحسەش لە (کتیبێ دین قانونی ژینە)دا ڕون کراوەتەوە (قورپان) کە بۆ حەزرەتی موحەممەدﷺ هاتوەو قانون و یاسای تەواوی موسوڵمانانە و شەشهەزار و شەشسەدو شەست آیەتە ـ بەلای هێندێکەوە شەش هەزار و شەشسەد و شەست و شەش ئایەتە، یەکهەزاری (ئەمرە) یەکهەزاری (نەهیە) یەکهەزاری (وەعدە) یەکهەزاری (وعیدە). یەکهەزاری (قصصّەیە) یەکهەزاری (ئەمثاڵە) پێنج سەدی (ئەحکامە) ـ یەکصدی (تەسبیحە) یان بە قەولی هیندێک یەکسەدو شەشی (تەسبیحە) کە مەبەستی ئێمە لێرەدا (ئەمر و نەهیە) ئەمریش دو بەشە، بەشی یەکەم ئەمری خووایە کە پێی دەگوترێ (واجب، فەرض) هەرواش پێی دەگوترێ حەڵاڵ بەشی دوهەمی ئەمری پێغەمبەرﷺ پیی دەگوترێ (سوننة، و مەندون) بەشی دوهەم دیسان دو بەشە، بەشی یەکەمی ـ نەهی لەلاین یەزدانەوەیە ـ کە پێی ـ دەگوترێ (حەرام) بەشی دوهەمی لەلاین پێغەمبەرەﷺ و پێی دەگوترێ (مەکروە) بەلای هێندکانەوە (خیلاف الأولاش لەبەر چاو دەگرێت) بەشی یەکەمی دین ـ ئیمانە، ئیمان بیرو باوەڕێکی ڕاستەقینە و دور لە گومانە ـ بە وجودی (خووا) کە (خالیقی هەمو بونەوەرێکە و مالیکی هەمو بونەوەرێکە و ڕازیقی هەمو

بونەوەرێکە) بە وجود ملائیکە و بە حەقانییەت و ڕاستەقینەی کتیبە کانی ئاسمانی (سحوف و تەورات و زەبور و أنجیل و قورئان) و حەقانییەتی پێغەمبەران و بەهاتنی ڕۆژی قیامەت و بە قەزاو قەدەر لە تەرەف خوواوەیە جا بزانین. ئیمان (کە هەر شەش بەشەکانی لە کتێبی (دین قانونی ژینە) بە ڕوناکی ڕاگەیەندراوە) قازانج و بەرهەمی بۆکێیە لێرەدا لە بەلگەوە لیلی نەقلی (آیت و حدیث) چاوپۆشی دەکەین و دەگەڕێینەوە بولای عەقل و بیرو فکری خۆمان بەوردی سەرنج بدەین ـ لە ڕەئیس پاسگایەکەوە هەتا دەگاتە ڕەهبەرێک ـ کەسێک هەتا لەوانە نێزیکتر بێت و هەتا لە پلەی سەروتر نیزێکتر بیت ژیانی خۆشترەو ئەوەی کە دەگەڵ دەسەلات دارێک زۆر تیکەلی هەیە و دەسەلات دارەکەش هەتا هێزی پتر بێت ئەو کەسە ژیانی خۆشترە و ڕێزو ئیحترامی زیاترە جاهەر کەسێک کە بە ڕاستەقینە ئیمان و باوەڕی بە خووا هەبێ کە (خالیق و مالیک و ڕازیقی هەمو بونەوەرێکە) و بالاترین دەسەلاتدارە، زۆر ڕوناکە، ژیانی پیرۆزەو خاوەنی ڕێزو ئیحترامە لە دنیاو قیامەت (پەسلان)دا با ئیمە بیر بکەینەوە ـ ئەوانە کە ـ بە ڕاستەقینە بە ناوی خووناسی خۆ دەخەنە بەر چاو بە ڕوناکی خووناسی بە نێو خەلقدا بلاو دەکەنەوە ـ وەکوو زانیارە بەرزەکانی ئاینی و اوستادە ڕاستەقینەکانی تەریقە خاوەنی ژیانێکی پیرۆزو سەر بەرزو شەرافەتمەندانە بون و هەزاران سەدە دووا مردنیشیان ناویان بە پیرۆزی و شەرافەتمەندانە ماوەتەوە بۆ نمونە هەر لە زەمانی دەورانی ژیانی ئێمەدا (شێخ عثمان

سراج‌الدین) (خوایی لێ ڕازی بێت) چونکە بە ناوی خواناسی خۆیی نیشان داو خواناسی بەنێو خەڵقدا بڵاوە کردەوە ژیانی لە رەئیس جمهورێک خۆشترو بەرزتر بو - جا ئەو بەڵگەیەکی ڕوناکە - لەسەر ئەوە کەسێک - بەڕاستی ئیمانی بەخوا بێت و پەیرەوی لێ بکات خۆشبەختی دنیاو پەسلانەو دەبینین خواناسەکان پاشی سەدها ساڵ مردن کۆمەڵ بۆ زیارەتی قەبرەکەیان دەچن، لێرەدا ڕون بووە کە ئیمان بە خوا قازانج و بەرهەمێکی زۆری بۆ ئەو کەسەیە ئیمانێکی یەقینی بەخوا هەیە و لەدنیاو پەسلان‌دا سەربەرزو پیرۆزە جا ئەگەر بە دەلیل و بەڵگەی عەقڵی بۆمان ڕون بوۆە کە ئیمان بە خوا و پەیڕەوی لە قانون و یاسای خوۆا قازانج و بەرهەمی بۆ خواناسەکەیە + دەلیل و بەڵگە نەقڵێ بەیان دەکەین و گەورەترین دەلیل نەقلێ کەلامی خوایە (قوڕان) خوای مەزن لە قوڕانی پیرۆزدا سورەای الکهف آیەی ۱۰۷دا دەفەرموێت: (إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَانَتْ لَهُمْ جَنَّاتُ الْفِرْدَوْسِ نُزُلًا) واتە - بە ڕاستەقینە ئەوانەی ئەوتۆ کە ئیمانیان بە خوا هەیە و خاوەن ئیمانی ڕاستەقینەن و بە گوێرەی قانون و یاسای خوا (قورئان) ژیان دەکەن (جنّات الفردوس) کە خۆشترین شوێنی بەهەشتە بۆ ئەوان دانەراوەو پێیان دەبەخشەرێت جا ئەوە گەورەترین موژدەیە بۆ خواناسەکان دیسان دەبێ بیر لەو موژدەش بکەینەوە کە خوا فەرموی ئەوانەی ئیمانیان هەیەو عەمەلی ساڵح دەکەن واتە ئیمان بە تەنێ بەکار نایە و بەڵکو ئیمان دەبێ لەگەڵ عەمەلی سالح بێت - جا بزانین عەمەلی سالح کامەیە - عەمەلی سالح پێکهێنانی ئەرکانی

ئیسلام و دوری له نههیه کانی خوایه واته ئەوەی که خووا فـەرمویەتی بکرێت و پێکی بێنی و ئەوەی که خووا فەرمویەتی نه کرێت دوری لێ بکریت ـ ئەرکانی ئیسلام ئەوّولیان (ئیقرارو بەیان کردنی ئیمانه به زوبان یان به أیشارە بۆ ئەو کەسانه لاڵن و زوبانیان گیره که پێی ده گوترێ شەهادە (که بەشی دوهەمی دینه) بەوشێوه **(اَشْهَدُ اَنْ لاٰ اِلٰهَ اِلاّٰ الله و اَشْـهَدُ اَنَّ محمداً الرَّسُولَ اللهِ)** واته به زوبان دەڵێم و بەدڵ باوەڕم هەیه کـه هـیچ مەعبودی به حەق نین اِلاّ زاتی خووایه ک نەبێ که ناوی اللّٰهیه و به زوبان دەڵێم و بەدڵ باوەڕیم هەیه که حەزرەتی (محمدالمصطفیﷺ) رەسوڵی به حەقی خووایه (پرسییار) قازانج و بەرهەمی شەهادە چییه وه بۆ کـێیه (وەڵام) قازانج و بەرهەمی بۆ ئەو کەسەیه به سەڕاحەت دە گەڵ پاکی دڵ أیقرارو بەیانی ئیمان دە کات (یه کەم) له دونیایه موسوڵمانان دەیناسن و ئاگادار دەبن بەسەر حاڵی ئەو کەسەداو به برای دینی خویانی دەژمـڕن. (دوهـەم) خـۆین و مـاڵ و نـاموسی لەسـەر مـوسوڵمانان حـەرام دەبـێ. (سێهەم) ئه گەر پێویستیه کی بو یارمەتی دەدەن. (چوارەم) ئه گەر زوڵمی لێ کرا پشتیوانی ده کەن. (پێنجەم) ئه گەر نەخۆشبو ئەحواڵپرسی ده کەن. (شەشەم) ئه گەر پێویستی دوکتور بو لەسەر موسوڵمانان لازمه بیبەنه لای دکتوڕ و دەرمانی بکەن. (حوتەم) ئه گەر مرد دەبێ کفن دفنی بکـەن و دڵخۆشی و یارمەتی وارسه کانی بکەن و دە گەڵ ئەوانەش یەزدانی مەزن (جنّاتالفردوسی) بۆ داناوه که نـیعمەتێک لەوه چـاکـتر وجـودی نـییه (بەشی سێهەمی دین) (که بەشی دوهەمی ئەرکانی ئیسلام)ە نوێژە ـ نوێژ

پیکنایە بەبێ دەستنوێژ واتە دەبێ لەپێشدا بزانین دەستنوێژ چییە - دەستنوێژ لە کتیبی (دین قانونی ژینە) بە تەواوی بەیانم کردوە و پێویست نییە لێرەدا دوبارەی بکەمەوە (پرسیار) قازانج و بەرهەمی دەستنوێژ چییەو بۆ کێیە (وەلآم) قازانج و بەرهەمی بۆ ئەو کەسەیە کە دەستنوێژ دەشوات (یەکەم) خوێی نیشان دەدا کە موسوڵمانە و پەیرەوی لە قانونی خوا (قورئان) دەکات (دوهەم) نەزافەت و خاوێن بونەوەی لەشیەتی (سێهەم) بە ئاوی دەستنوێژکەی حەرارەت و فشاری خوێنی کەم دەبێتەوە کە بو سیححەتی لەش پێویستە چووارەم بە حازران نیشان دەدات کە شخصێکی موسوڵمانە و موسوڵمانیش هەمویان برای دینی یەکترن و ئەوە شیاوی ئەو شەش تایبەتیانەی برای موسوڵمان دەبێت کە لە باسی شەهادەتدا بەیان کران. (پێنجەم) حەدیسی موتتەفەقوعەلەیهییە **(موالتفق علیه)**یە بە کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی، ئۆممەتی من (أمّتی من) دێنە مەیدانی مەحشەرێ کە شوێنی دەستنوێژیان وەکو مانگی شەوی چاردە شۆقێ دەدات و خاوەنی دەستنوێژ، بەو فەیزو بەرە کەتەش دەگات کە لە هەموو نیعمەتێک باشترە، حەدیسەکەش ئەوەیە:

**ریاض الصالحین ص ٣٦٩ عَن أبِی هُرَیْرَة (ر) قَالَ سمعت رَسُولَ اللهِﷺ یَقُولُ إنَّ أمّتی یُدْعَوْنَ یومَ الْقِیامَةِ غُرّاً مُحَجَّلِینَ مِنْ ئاثارِ الوُضُوءِ ـ الخ)**

(شەشەم) دوبارە پێغەمبەر بە حەدیسی (موالتفق علیه) هەر لەو ص ٣٦١دا فەرمویەتی، کەسێک دەستنوێژ بە جوانیو بە تەواوی دەشوات گوناه و تاوانەکانی لە بەدەنی دێنەدەرێ هەتا لەبن نینۆکانی خارج دەبن

حەدیسە کەش ئەوەیە (عن عثمان أبنِ عَفّانﷺ قال ـ قالَ رسولُ اللهِﷺ مَنْ تَوَضّأَ فَأَحْسَنَ اَلْوُضوءَ خَرجَتْ خَطایاهُ مِن جَسَدِهِ حَتّیٰ یَخْرُجَ مِنَ تَحْتِ أظفارِهِ ـ رواه مسلم). وە لەو بارەدا حەدیس زۆر هەن کە ناکرێ لەو کتێبە کورتەدا بەیان بکرێن جا ئیمانداری بەرێز چ فەیزو بەرە کەتێک لەدین چاکترە کە تەنیا دەست نوێژیک ئەو هەمو پیرۆزیانەی تیدا هەن کەهەر ـ زە کاتیکیان بەیان کراوە لێرەدا ـ دووای دەستنوێژ (پرسیار) با بزانین نوێژ قازانج و بەرهەمی چییەو بۆ کێیە (وەڵام) نوێژ لە کتێبی (دین قانونی ژینە)دا بەهەموو پێویستیە کانییەوە بەیانم کردووە ـ قازانجە کانی نوێژ ئەوانەن (یە کەم) نوێژ وەرزشێکە کە هیچ وەرزشێکیتر ناتوانی بۆ گەڕانی خۆین و تە کان وە حەرە کە خستنی ڕە گی بەدەنی ئینسان بە کەڵکبێت وە بە تاقیکاری زۆر سابت بووە کەسێک زۆر نوێژی سونەت دە کات بە تایبەت شەو نوێژ بەدەنی سالمترەو تەمەنی درێژتر دەبی. (دوهەم) خۆیی نیشان دەدات کە موسوڵمانەو ئەو ئەرکانەی پیویستی برایەتی موسوڵمانانە کە هێندێکی لە بەحسی شەهادەتدا بەیان کران ئەویش دە گرێتەوە (سێهەم) ئینسانی نوێژخوێن لەلای هەموو موسوڵمانیکی پاک و خۆشەویستەو شوێنی براوو ئیعتیمادە، (چوارەم) بەهەر رکاتێک لە قیامی ئەلفە، ڕکوعی لامەلفەلایە، سەجدەی، هێیە. و نیشان دەدات کە عەبدی (الله)یە و سەری تەعظیم بۆ خووا دەخاتە ئەرزێ. (پێنجەم) لە تەواوی ئەو کاتەی مەشغوڵە بە نوێژ دەستی لە هەمو فیتنەو فەسادێک دەبڕێت و هیچ هەڵەو تاوان نا کات. (شەشەم) بەدا بەستنی نوێژ

أیقرار دەکات و هاوار دەکات کە خووا لە هەمو مەوجودێک گەورەترە و دەڵێ (**الله أكبر**) (**اى الله اكبر من كل شيئى سواه**) (بەڵام خووا لە ذاتی خۆیی گەورەتر نییەو زاتی هەر ذاتی خوایە) وە ئەوا أیقرارەی لە ڕوکنەکانی نوێژدا دوبارە دەکاتەوە و دەڵێ خووا لە هەمو شتێک گەورەترە. (حەوتەم) وە گرتنی فەیزو بەرەکەتی خوێندنی فاتیحەیەو ـ دەچێ بۆ خوێندنی سوڕەتیکی قورئان کە بە فەرمایش و بیروڕای تەفسیر بەزەکانی موعتەبەر بە (**أمُّ الكتاب**) ناو براوە و فەرمویانە لە هەموو سوڕەتەکانی قوڕئاتن گەورەترو پیرۆزترە و ئەویش (چوار بەشە) (بەشی یەکەمی) مەدح و سەنای خووایە قودڕەت و عەزەمەتی خووا بەیان دەڵێ (**بِسْمِ اللهِ الرَّحمٰنِ الرَّحِيمِ**) بە پیرۆزی و بەرەکەتی نێوی یەزدانی مەزن، بژیو دەرو خاوەن بەزەییە (**اَلْحَمْدُ لله رَبِّ الْعالمِينْ**) حەمد و سەنای دور لە بژێرە بۆ یەزدانی مەزنە کە وەدی هێنەرو تەربییەت دەهەندەی هەمو بونەوەرێکە (**اَلرَّحْمنِ الرَّحِيمِ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ**) بژیودەری هەمو زیندەوەرو بونەوەرێکەو خاوەن ڕوحم و بەزەییە بۆ هەمووەدی هێنراوەکانی خوێی و مالک و داوەری ڕۆژی (قیيامەتە) پەسڵانە (بەشی دوهەمی) خیتابە واتە ئەو مەدح و سەنایەی کە نۆیژخوێنە کە بە کەلیماتی غایبی بەیان کردوە فەیزو و بەرەکەتی هێندە زۆرە نۆیژ خوێنە کە بە نوری خووا گەیشتووە و قسە دەگەڵ خووا دەکاو دەڵێ (**إيَّاكَ نَعْبُدُ وَإيَاكَ نَسْتعِينُ**) واتە خووایە هەر بۆ تۆ عەبدایەتی دەکەم و هەر لە تۆش تکای کۆمەک و یارمەتی دەکەم لەهەمو باڕێکەوە (بەشی سێهەمی) تکای ڕێنوێنی و باقیمانەوە لە

سەر پەیڕەوی قانون و یاسای خووایەو دەڵێ (اِهْدِنَا الصِّرَاطَ المُسْتَقِيمَ) واتە ـ ئەی خووایە ئەتۆ شارەزام بکەو سابتم بکە لەسەر ڕێگای ڕاست کە پەیرەوی لە قورئانە و بەجێ‌هێنان و پیکهێنانی دەستورەکانیەتی (صِرَاطَ الَّذِينَ أَنْعَمْتَ عَلَيْهِمْ) ئەو ڕیگا ڕاستە، ڕێگایەکی ئەو تۆیە کە بە فەضل و ڕەحمەتی خۆت لە دەریای کە ڕەمی خۆت بەخشیوتە بەو کەسانە کە نیعمەتی بەرەکەتی خۆت بەسەردا ڕشتون کە عەبدانی پاکی‌تون و، ئەمنیش لەوانە بژێرەو بەرەکەت و پیرۆزی وانیش بەسەر مندا بڕێژە (بەشی چوارەم) خۆ پارازتنە لە قەهر و غەزەبی خوا و دەڵێ (غَيْرِ المَغْضُوبِ عَلَيْهِم) خووایە حیسابم مەکە، لەو کەسانە کە قەهرو غەزەبی خۆت بەسەردا رشتون و کافربوون (وَلاَ الضَّالِّينَ) خووایە هەروا حیسابم مەکە، لەو کەسانە کە ڕێگای حەقیان لێ ون بووە سەرشێواو گومڕاهن.

## پڕاو خۆشکانی موسوڵمان
## سورەی (فاتیحە)

تەفسیر کبیر لە ٢٩٠ لاپەڕە - تـەفـسیری طـبری ٨٩ لاپـەڕە تەفسیری طبری لە ١٠٩ لاپەڕەدا بەیانیان کردوە – ئـەمـن لێـرەدا قەتریەک لەو دەریا بێبن و لێوارەم، نیشان داوە کە بێر بکەنەوە کە لە هەمو شەو ڕۆژێکدا حەڤدە کەڕەت، ئەو هەمو پیت و بەرەکەت و ڕەحمەتە کە لە لاین یەزدانی مەزن بو عەبـدو بـەنـدەکـانی خـۆی دیاری کردووە و لە پێنج نوێژدا پێکدێت، وەکو بۆنی گولێ باغـاتی بەهەشت بۆنێکی لێ بکە ن و بەشوێن بۆنەکەدا بڕۆن تا بە یارمەتی خووا بگەن بە گوڵ و باغاتـەکـە - (هـەشـتەم) خوێنـدنی (تَحِيَّات) تەحییات حەوت بەشە: (بەشی یەکەم) جلوسـی قـادر بـە جلـوس (بەشی دوهەم) (اَلتَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ) عەبدی پـاک و پـیروز لـە بـەرابـەری (خالیق و مالیک و ڕازیقی خوێی) یەزدانی مەزن بە چوکدادێ و بە دلێکی پڕ لە ئیخلاسییەوە سەری بەندەگی نەوی دەکـات و دەڵـێ (اَلتَّحِيَّاتُ لِلّٰهِ) واتە ژیبانی هەمیشەیی بـێ سـە رەتـاو بڕانـەوە بـۆ - خووایەکە – (خالیق و مالیک و ڕازیقی هەمو بونەوەرانـە) (بـەشـی سێهەم) (سەلام لە سـەر نـەبی) دەزانـێ کـە نـوری سـەعـادەت و بەختەوەری کە دینی ئیسلامە بە هۆیی پێغەمبـەرەوە پێگـەیـوە ڕو دەکاتە پێغەمبەرو دەڵێ (اَلسَّلَامُ عَلَيْكَ اَيُّهَا النَّبِيُّ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكَاتُهُ) ئەمینی و دوری لە هەمو عەیب کـورت و کـەمـی دەگـەڵ فـەیـزو ڕەحمەت و بەرەکەتی خووا لە سەر تۆیە ئەی پێغەمبـەری خـووای هەموو بونەوەران (بەشی چـوارەم) (سـەلام لـە سـەر عبـاد) تکـای

ڕەحمەت و بەرەکەت دەکا بۆ خۆی و بۆ عەبدانی پاکی خوواو دەڵێ (اَلسَّلامُ عَلَيْنا وَ عَلَى عِبادِ اللّٰهِ الصّالِحِينَ) ئـەمـینی و ڕەحمـەت و بەرەکەتی خووا لە سەر ئیمە و هەمو عەبدو بەندەکانی سالحی خووا بێت. (بەشی پێنجەم) شەهادە پـەیمـان و بـەڵـێن دەگـەڵ خـوواو ڕەسوڵی خووا نوێی دەکاتـەوە دەڵـێ (اَشْهَدُ اَنْ لا اِلٰه اللّٰهُ وَ اَشْهَدُ اَنَّ محمداً رَسُولُ اللّٰهِ) بە زوبان دەڵێم و بـە دڵ بـاوەڕم هـەیـە کـە هـی خووایە نییە کە بە حەق عەبدایەتی و بەندەگـی بـۆ کرێـت إلاّ ڕاتی خووایەک نەبێ کە ناوی (اللّٰه)یە وە بە زوبان دە لێم و بە دڵ باوەڕم هەیە کە حەزرەتی موحەممەدﷺ ڕەسول و پێغەمبەری بە حەقـی خووایە. (بەشی شەشەم) سەڵەوات لە سەر نەبی

(بەشی حـەوتـەم) سـەلامـی لای ڕاسـت دەی هـەوێ تکـای ڕەحمەت و بەرەکەت بۆ هەموو عەبدو بەنـدەکـانی خـووا بکـات ڕو دەکاتە لای ڕاست سەرەتاو دووایی لای چەپ و دەڵێ: (اَلسَّلامُ عَلَيْكُمْ وَ رَحْمَةُ اللّٰهِ وَ بَرَكاتُهُ) ئەمینی و ڕەحمەت و بەرەکەتی خووا بۆ ئێـوە بـێ ئەی بەندەگانی پاکی خووا. (پێویستە ئەوەشمان لـە بـیر نـەچێـت ئەوەی کە بەیان کراوە تەنیا واجباتەکانن و لە هەموو سوننەتـەکـان چاوپۆشی کراوە) - ئەی عەبدی پاک و ساڵحی خووا - بـاش چـاو بکەرەو بە وردی سەرنجی نۆیژ بدە کە (دەنکێک لە خلواریکم بەیان کردوە لێرەدا) یەزدانی مەزن چەندە خاوەن بەزەییە دەگەڵ عەبـدو بەندەگانی خۆیی و ئەو هەموو فەیز و بەرەکەت و ڕەحمـەتـەی بـۆ عەبدانی خۆی دیباری کـردووە، وە بـۆ ئـەو کـەسـانەی پـەیـڕەوی دەکەن بەهەشتی بۆ داناون.

(بەشی نۆهەم) بەڵگەو دەلیلی نەقڵی کە باشترە لە هەموویـان ئایەتی قورئانە، کە لە سورەی بەقەرە ئایەتی سێ و چووار و پێـنجدا یەزدانی مەزن فەرموویەتی: ﴿ٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِٱلْغَيْبِ وَيُقِيمُونَ ٱلصَّلَوٰةَ وَمِمَّا رَزَقْنَٰهُمْ يُنفِقُونَ ۝ وَٱلَّذِينَ يُؤْمِنُونَ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ وَبِٱلْءَاخِرَةِ هُمْ يُوقِنُونَ ۝ أُو۟لَٰٓئِكَ عَلَىٰ هُدًى مِّن رَّبِّهِمْ ۖ وَأُو۟لَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ﴾ واتە – ئەوانەی ئەوتۆ کە بیرو بـڕوای ڕاسـتەقینـەیـان هەیە – بە غەیب کـە یـەزدان و قـانونی یـەزدانـە وە بـە گـوێرەی شەڕایتی نوێژەکە – نوێژ دەکـەن و لـەو مـاڵ و سـامانە کـە خـووا پێیداون سەرفی دەکەن – بۆ مـاڵ و عائیلـەی خویـان و زەکـات و سەدقات دەبەخشن و ئەوانەی بیرو بڕوایان هەیە بە ڕاستەقینە بەوە کە ئەمن ناردومە بۆ تۆ ئەی موحەممـەدﷺ کـە (قورئانـە) وە بـەو شتانە کە لە پێشودا ڕوانەم کـردون وەکـوو پێغـەمبـەران و کتیبـە ئاسمانیەکان و بیرو بڕوای ڕاستەقینەیان بە ڕۆژی قیيامەت هـەیـە، ئەوانە لە سەر ڕێگای ڕستەقینە شارەزاکراون و لـە تـەرەف خـووای خۆیانەوە و لە هەموو کوسب تەگەرو چارەڕەشی پەسـلان نـەجـات دراون (خووایە ئێمەش نەجات بدەی).

## بەشی چووارەمی دین
## کە سێهەمی ئەرکانی ئیسلامە – زەکاتە –

زەکات کە بە مەعنا پاک کردنەوەو خاوێن کردنەوەیە لـە قـانونی دینیـدا میقدار ماڵ و جینسیکی دیاری کراوە کە (لە کتێبی دی – قانونی ژینـە)یـە تەواوی بەیانم کردووە (پرسیار) با لێرەشدا بـزانین قـازانج و بـەرهـەمـی

زەکات چییە و بۆ کێیە (وەلام) قازانجی مادییە کەی بۆ ئەو کەسەیە کە زەکات وەر دەگرێت. بەڵام قازانجی دینیە کەی بۆ کۆمەڵی ئیسلامە (یەکەم) زەکات دەرماڵە کەی بە جودا کردنەوەو بەخشینی بەو شێوەیە کە لە دیندا دیاری کراوە ماڵ و سامانە کەی خاوێن دەبێتەوەو لە نەزەری دیندا حەڵاڵ دەبێت. (دوهەم) کۆمەک و یارمەتی بەهاونەوعانی خۆیی کردووە و کۆمەڵێکی ژن و منداڵ برسی تێرو تەسەل کردووەو لە مەزیقە رەزگاری کردون. (سێهەم) دینداری و خواپەرستی وی لە نێو کۆمەڵێکدا ڕون و ئاشکار دەبێ و کۆمەڵێکیش چاوی لێ دەکەن و سەدەقە و خیراتی زۆر دەکەن وکە هەموویان وە بەر (وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ) آیەی / ١٠٧ الکهف کە لە لاپەرەی (حەوت)دا بەیان کرا) کە چاکترین موژدەی نیعمەتی خوایە دەکەون. (چوارەم) زەکاتدەر لە نێو کۆمەڵدا سەربەرزو قسەڕەوایە و کۆمەڵ ڕێزی لێ دەگرن. (پێنجەم) زەکات وەرگر. بەوەرگرتن و پێگەیشتنی زەکات دەبوژێتەوەو ناچار نابێ بۆ ئەوە دەستکات بە سواڵ و کاری سوک و بێشەرعی. (شەشەم) تەعدیلی سەروەتە لەنێو جامیعەی ئیسلامدا، چونکە زەکات دەری واقعی سەروەتی کەمکەمە دێتە خووارو زەکاتوەرگر کەمکەمە سەروەتی زیاد دەبێت و فەقیری و موحتاجی لەبەیندا نامینێت (وەکوو لە زمانی خەلافەتی حەزرەتی (عمربن عبدالعزیز) چونکە بەڕاستی و بە گوێرەی شەریعەتی ئیسلام زەکات و سەدەقات دەبەخشەرا، فەقیر و موحتاج، نەمابوو کە موددەتی سێ سال و بە ڕیوایەتی هێندیکیان موددەتی شەش سال

کەسێک نەمابو زەکات و سەدەقات وەربگرێت چونکە فەقیر نەمابو لە مەنتقەدا بەڵکو زەکات و سەدەقات دەچۆە بەیت‌الماله و عەنبار دە کرا).
(حەوتەم) بەجێ‌هێنانی فەرمانی خووایەکە یەکێک لە ڕوکنە گەورەکانی ئیسلامی پێکهێناوەو خۆی گەیاندۆ تەرپزی ئەو عەبدە پاکانە کە یەزدان وعدەو بەڵێنی بەهەشتی پێداون و لە ئۆممەتی پێغەمبەرﷺ حیسابکراون، برای موسوڵمان بەڕاستی زۆربە وردی بیر لەو نوسراوە بکەوە کە قەترەیەکە لە ئەقیانوسی دینی ئیسلامە، کە پێکهێنانی هەر ئەمری خوا چەندە بە سودو قازانجی عەبدەو بەرو بەهرەکەی هەر بۆ عەبدەو خووا پێویستیەکی نییە. (هەشتەم) دەلیلی نەقلی کە گەورەتر لە هەموویان (قورئانە) (لە سورەی بەقەرە آیەتی ٢٧٧) یەزدانی مەزن فەرموویەتی (وَ اَقَامُ الصَّلٰوةَ وَ آتُوا الزَّكٰاةَ لَهُمْ اَجْرَهُمْ عِنْدَ رَبِّهِمْ). واتە، ئەوانەی نوێژ دەکەن و زەکات لە ماڵی خۆیان دەبەخشن لە بۆوان هەیە ئەجرو پاداشێکی زۆر لەلایەن وەدیهێنەری خۆیانەوە. (لەوبارەدا ئایەت زۆرن کە لێرەدا ناکرێت بەیان بکرێن) لێرەدا ئیمانداری پاک، باش بیر بکەینەوە کە لەو ئایەتەو، ئایەتەکانی سی‌و چووارو پێنجی هەر ئەسورەتەی بەقەرە کە لە پێشەوە بەیان کران (و سەدها ئایەت و حەدیث دیکە کە لێرەدا ناکرێ بەیان بکرێن) یەزدانی مەزن بەڵێن وەعدەی، پاداشی زۆری داوە بە نوێژخۆین و زەکات دەران و زۆریش ڕوناکە پاداشی خووا بۆ عەبدو بەندەکانی بەهەشتە کە هەرچی چاو پێی جووانبێت و نەفس پێی خۆشبیت لە بەهەشتێدا هەیە، جاگیانی عاقڵ و تێگەیشتو چۆن دەبێ ژیانی خۆش

و هەمیشەیی بفرۆشێت بە چەندو ڕۆژ ژینی دنیای پڕ لە فیتنە و فەسادی تێکەڵاو دەگەڵ هەزاران غەم و جخار.

## بەشی پێنجەمی دین
## کە بەشی چوارەمی ئەرکانی ئیسلامە = ڕۆژویە

ڕۆژو لە (کتیبی دین قانونی ژینە)دا بە تەواوی بەیانم کردووە (پرسیار) با لێرەشدا بزانین قازانج و بەرهەمی ڕۆژو چییەو بۆ کییە (وەڵام) قازانج و بەرهەمی ڕۆژ و بۆ ئەو کەسەیە دەگەڵ پێکهێنانی پێویستیەکانی ڕۆژو ـ بە ڕۆژو دەبێت (یەکەم) بە هۆی نەخواردن و نەخواردنەوە برسی و تینو دەبێت و دەزانێ ئەو هەژار و فەقیرانە کە هیچیان نیە چەندە لە عەزاب و چارەڕەشیدان دەکەوێتە بیریان و ئەگەر توانای هەبێت یارمەتیان دەدات. (دوهەم) ئەو خۆراکەی لە بەیانی و نیوەڕۆدا بۆی دەگەڕێتەوە، ئەگەر دڵی تامی تەقوای کردبێ ـ دەیبەخشی بە ـ هەژارەکان (سێهەم) بۆکەسێکی کەم دەرامد بێت و ماڵ و منداڵێ زۆر هەبێت ئەو میقدارە گەڕانەوەی خۆراک هێندێک کەم کورِی ژیانی ڕاست دەکاتەوە. (چوارەم) ئەوانەکە ژیانیان باشە و هێزی ماڵیان زۆرە، بە پێی داب و دستور خۆراک و پۆشاکی زیاتر و چاکتر بکار دینن و ماڵ زیاتر سەرف دەکەن کە بە هۆی ئەوە هێندکیش بە هەژارەکان دەدرێت و یارمەتیان دەکرێت. (پێنجەم) فیترەیە کە زەکاتی بە دەنیە لە مانگی ڕۆژودا (رمضان) فەرزە و بلاّو دەکرێتەوە یارمەتیەکی باشە بۆ فەقیرو

هەژارەکان. (شەشەم) لاوەزی و تیشکانی شەهوەت و ئارەزۆیە کە دەبێتە هۆی کەم ئارەزوی جینسی و دە گەڕێتەوە لە تەماشای نامەحرەم و نەزەری حەرام و زیناو فەسادکاری. (حەوتەم) تەزکییە و پاکبونەوەی نەفس و خۆێنیە، چونکە ئینسانی بەرۆژو کەمهێزەو زۆر بە ئەملاو ئەولادا ناچێت و زۆر هەلناسوڕێ کە ئەوەش دەبێتە هوی دوری لە شەڕو کێشە و نیزاع و دوری لە هەموو فیتنەیەک بەڵکوو مەشغوڵ دەبێت بە تاعەت و یادی خووا و گییان و خۆێنی پاک دەبێتەوە لە کەسافەتی گوناە و تاوانو مەیلی خوواپەرستی زۆر دەبێت کە هەر ئەوەش پلەی سەعادەت و خۆشبەختیە. (هەشتەم) حەسانەوەو پشودانی میعدەیە، کە لە ماوەی یازدە مانگی ساڵ پڕو هەڵدمساوەو و ماندو شەکەتی تواندنەوەی خۆرا کەو لەو ماوەیەدا کە بە ڕۆژویە خاڵی دەبێتەوە درزو قڵشتەکانی وێکدە کەونەوە و چاک دەبنەوە (شایانی باسە کە بە نەزەری لقێکی تیبی ڕۆژو، بۆ زەخمی میعدە زیانی هەیە بەڵام بە تەجرەبەو تاقیکاری سابت بووە کە ڕۆژو باشترین دەرمانی میعدەیە و کەسانێک میعدەیان سست و زەعیفە لە غەیری ڕەمەزانیشدا کەم خواردن = باشترین دەوایە. (نۆهەم) بەجێهینان و پەیرەوی لە ئەمری و فەرمانی (خالیق و مالێک و ڕازیقی) خۆویەتی و خاوەن ڕۆژو دەڵێی ئەی وەدیهێنەرو خاوەن و بژیودەری، ئەوا ئەمن وا ئەمن زوبانی خۆم گرێدا لە بەیانی حەرام و چاوی خۆم بەست لە تەماشای حەرام و گوێچکەی خۆم ئاخنی لە حەرام و هەمو خواردن خواردنەوەم لە خۆم بڕی بۆ پێکهێنانی ئەمری تۆو تکای ئەجرو پاداشم هەیە یەزدانی مەزنیش

هەروەکو لە پیشەوەدا (لاپەڕە حەوت)دا بەیان کرا لە ئایەتی / ١٠٧ الکهفدا فەرموویەتی: ئەمن بۆ ئەو کەسانە کە خاوەنی ئیمانن و عەمەلی ساڵح دەکەن (جنّات‌الفردوس)م بۆ داناون و ڕۆژش باش‌ترین عەمەلی ساڵحە واتە ـ ئەتۆش لە خێڵی بەهەشتی حیساب کراوی. (دەهەم) لە (أحادیث صحیح)دا کە لە هەموویان کورت‌تر (ریاض‌الصالحین)ە لە لاپەڕە ٤١٣دا بۆ ڕۆژو ئەو فائیدانە بەیان کراوە. (یەکەم) ڕۆژو بەهەشتە. (دوهەم) ڕۆژو تەنها بۆ خووایە و خوا پاداشی دەداتەوە. (سێهەم) بۆنی زاری خاوە ڕۆژو لەلای خووا لە بۆنی عەترو میسک خۆشترە. (چوارەم) بۆ خاوەن ڕۆژو دو جێژن هەن: (یەکەم) کاتی ئیفتار و بەربانگ. (دوهەم) لە ڕۆژی پەسلاّندا (قیامەت) کە بە لیقای خووا گەیشت. (پێنجەم) لە ڕۆژی پەسلاّندا لە (باب‌الرّیان) کە دەرگایەکی بەهەشتە بانگ دەکرێت بۆ ناو بەهەشت. موسوڵمانی بەشەڕەف ئەوەی بەیانم کردوە ـ دەنکێکە لە حەڵوارێکە، بۆ چەند ڕۆژ، ژینی دنیای پڕئاژاوەو فەساد، ژینی هەمیشەیی بەهەشت لەقیس خۆت مەدە.

## بەشی شەشەمی دین
## کە بەشی پێنجەمی ئەرکانی ئیسلامە (حەجە)

حەج لە کتێبی (دین قانونی ژینە) بە تەواوی بەیانم کردووە (پرسیار) با لێرەشدا بزانین قازانجی حەج چییەو بۆ کییە (وەلاّم) قازانجی حەجێ بۆ حاجییە (یەکەم) سەیرو سەیاحەتی ئەو دنیا پان و برینە. (دوهەم)

تەجرەبە و تاقیکاری لەسەر وەزعی ژیان و فیربۆن و زانینی زۆرشت کە لیان بێ ئاگا بووە. (سێهەم) هەڵگرتنی باری غەریبی و دەردی دوری لە وەتەن و ماڵ و منداڵ و عەشیرە. (چوارەم) بیرکردنەوە لە حاڵی ئەو کەسانەیە کە لەسەر خاکە و وەتەنی خۆیان دەردە کرین و بێبەش و هێوابڕاو دەبن لە شوێنی أجدادی و رەسەنی خۆیان کە چەندە چارەڕەش و لێ قەڵماون. (پێنجەم) دیتنی ئەنواعی ئینسان بەڕەنگی جۆراو جورو بەدیمەنی لێک جوداو بە زوبانی لێکدورو نامۆ. (شەشەم) بو ژانەوە گەشانەوەی عیدەیەکی زۆر لە فەقیر و هەژارو بێ پەناو پەسیو بە وەرگرتنی و پێگەیشتنی خیرو سەدەقاتی حاجی کە ماڵ و منداڵێ برسی خۆیانی پی تێرو تەسەل دەکەن. (حەوتەم) پێگەیشتنە بە ئیمانیکی یەقینی و دور لە گۆمان کە دوای مردن ژینەوە هەیە و ڕۆژی قیامەت و مەحشەر حەقە، هەر وەکو ئێستا لەبەر چاویەتی وەکو خۆرەتاو دەبینی کە ئەو موعالەمە، پادشا و گەدا، جووان و ناحەز، فەقیرو سەرمایەدار، گەورە و بچوک، ساغ و نەخۆش، پیرو لاو، هەمویان بەیەک لیباس و بەیەک شێوەو یەک بەرنامە، خەریکی پێکهێنانی یەک دستورن وە لە هەمو ئەرکانەکانی حەجدا بێ فەرق و جودایی مەشغولێ پێکهێنانی حەجن، ئەوە بەڵگەو دەلیلێکی زۆر ڕوناک و ئاشکرایە کە قیامەت بەسەردا دێت و مەیدانی مەحشەر دێتەڕو هەمو بونەوەرێک لەسەرەتای دنیایە هەتا بڕانەوەی زیندو دەکرێنەوە بەپێی عەداڵەتی ڕاستەقینە حیسابی کردەوەیان دەکرێت و پاداشی چاکەو سەزای تاوانیان وەردەگرن. (هەشتەم) پەیرەوی لە ئەمرو فەرمانی (وەدی

هێنەرو خاوەن و بژیودەری) خۆیەتی کە دەستورو یاسای (وەدی هێنەری هەمو بونەوەری دنیای) پێکهێناوە کە موسۆگەرە پاداشی بە جێهێنانی ئەو ئەمرەش شیاوی عەزەمەت و گەرەی ئەو وەدیهێنەرەیە کە بەهەشتە. هەروەکو (وەدیهێنەرو خاوەن و بژیودەر) لە قانون خۆیدا کە بۆ ژینی بونەوەرانی دیاری کردوە (قورئان) لە سۆرەی آل‌عمران آیەی ٩٧دا فەرمویەتی: (وَ لِلّهِ عَلىٰ النّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنْ إسْتَطاعَ إلَيْهِ سَبيلاً) لە تەرەف خووایەوە فەرز کراوە لەسەر ئەو عەبدو بەندگانە کە هێزو توانای رێگەیان هەبێ (بو چون و هاتنەوە) جارێک پێویستەکانی حج پێکبێنن. موسوڵمانان بەڕاستی هەتا ئێرە ئەو شەش‌بەشانە کە قازانج و بەرهەمەکانیان لە هەر خەڵوارێک دەنکێکم نیشان داوە و لە هەموانیشدا لە دەلیل و بەڵگەی نەقڵی ئەعەم لە حەدیس و نەزەری زانایانی دینی جودا لە ئایەتێک بۆ نمونە چاوپۆشیم کردووە. ئەوەش بزانین کە بەڵگەی نەقڵی شیاوی باسەکان لەچەند موجەلّلەدا جێگای نابێتەوە) ئەمری خووای تەعالان و ـ واجبن و کەسێک تەرکیان بکات سەزای جەهەننمە. [بەشی دوهەمی دین ـ (نەهیە)] نەهییش (هەروەکوو لەسەرەتای کتێبەکەدا بەیانم کردووە) (دوبەشە) (بەشی یەکەم) نەهی لە تەڕەف خوایەوەیە کە پێی دەگوترێ (حەرام). بەشی دوهەمی، نەهی لە تەڕەف (پێغەمبەرەوەیە)ﷺ کەپێی دەگوترێ (مەکروە) لێرەدا ئیمە بەیانی نەهیەکانی یەزدانی مەزن دەکەین، نەهیەکانی یەزدانی مەزنیش خەراپتر لە هەمویان کوفرە، واتە بێباوەڕی بە خووا یان قانون و یاسایی خووا کە

کتێبە ئاسمانیە کانن و جامیعی هەموانیش قورئانە و پێغەمبەرانی خووان کە سەرداری هەموویان حەزرەتی (محمدالمصطفی)ﷺ. لە کتێبی (دین و قانونی ژینە) لە بەیانی ئیماندا ـ نیشانم داوە و ڕونم کردۆتەوە کە ئیمان چونەو چیە و پێچەوانەی ئیمان کوفرە، بەڵام، لێرەشدا پێویستە بە کورتی بەیان بکرێت. بەشی یە کەمی (نەهی یان مەنهییات) کوفرە، کوفر یان کافر ـ هەروە کو ئیستا بەیان کرا، بێباوەڕی بەخوا و قانون و یاسای خوایە، (پرسیار) با بزانین زەرەرو چارەڕەشی کوفر چیە و بۆ کێیە (وەڵام) سەرەتا لە بەڵگەو دەلیلی نەقڵی چاوپۆشی دە کەین و دە گەڕێینەوە بۆ عەقڵ و زانیاری پیروزی ئینسانی با زۆر ورد بیر بکەینەوەو تێ فکررین (یە کەم) چوارپێیە ک لەبەر دەرگای هەرکەسێک بێت هەر ئەوندە، نانی دەداتێ و هیچی تر، خاوەنی خۆی دەناسێت و پاسەوانی ئەو ماڵە دە کات. (دوهەم) ورچێک یان مەیمونێک، لە لۆتیە ک کە (بۆ قازانج و خۆ پێ ژیاندنی خۆیی) نانی دەداتێ خاوەنە کەی دەناسێت و بە فەرمانی خاوەنە کەی هەڵدەپەڕێ. (سێهەم) کەرێک، ئێسترێک یا حەیوانێکی تر هەر ئەوەندە کە خاوەنە کەی، کاو گیای دەداتێ: خاوەنی خۆی دەناسێت و ئەو هەمو بارە قورسانەی بۆ هەڵدە گرێت بە هەموو هێزو تووانای خۆی خزمەتی پێ دە کات کە پێیان دە گوترێ حەیوانی بی‌عیلم و عەقڵ. (چوارەم) ئینسانی کافر کە خاوەنی عەقڵە و زانیاری‌یەو تاقیکاری هەیە و بە چاو دەبینێت و بە گوێچکەی بیستویەتی و دەبینێ ئەو هەموو ئەرزە پان و بەرێنە کە ئەنواعی مەعدەن و دارو گیای تیدایە و ئەو هەمووە میوەیەو ئەو هەموو

ڕەنگە گوڵەی لە نێویدا دروست کراوە و ئەو هەموو ئاوە بنە هەموو ـ بونەوەرکانیەوەو ئەو ئاسمانە پان و بەرینەو ئەو هەموو ئەستێرەو مانگ و ڕۆژە کە بەیەک نیزام و دەستور دێن دەچن و ئەو هەموو بونەوەرە جۆراو جۆرە، پێی وایە، بێساحەبە و خاوەنی خۆی و ئەو دونیا سەرسوڕهێنەرە، ناناسێت دەگەڵ ئەوە دەزانێت هەر لە گۆزەو دیزەیەکی قوڕین یان دەرزی و سوژنێکەوە هەتا دەگاتە (ئاپۆڵوو، کامپیوتێر) هیچی لە خوۆە دروست نەبووە، ناشبێت، جا ئەگەر عەقڵی سەلیم و ویژدانی پیرۆزی ئینسانی بکەینە داوەر، ئەو ئینسانە حەق نەناسە کە خاوەنی عیلم و عەقڵ و زانیاری و تاقیکاریەیە کەمترو پیستر لە حەیوانی بیعیلم و عەقڵ بێت دەبی سەزای چەبێت؟ ڕوناکە سەزای توندترین عەزاب و پیسترین و پڕئازارترین شۆینی جەهەننمە. (پێنجەم) بەڵگەو دەلیلی نەقڵییە کە یەقینیترو سەحیحتر لە هەموویان قانونی خووا (قورئان) قانونی ژیانی بەشەرە کە یەزدانی مەزن لە سورەی (الأحزاب: ٦٤)دا فەرمویەتی: (إنَّ اللهَ لَعَنَ الْكَافِرِينَ وَأَعَدَّ لَهُمْ سَعِيراً) واتە: بە حەقیقەت و ڕاستەقینە یەزدانی مەزن، لەعنەتی کردووەو بێبەشی کردون لە ڕەحمەت و بەخششی خۆی کافرەکان و سازی کردووەو داینلوە لە بۆ کافران خەراپترین و پڕئازارترین تەبەقەی جەهەننەم وە زیاتر لە دوسەد ئایەتی (قورئان) تەسریح دەکەن بەوە کە کافر بۆ هەمیشە لە خەراپتر شوێنی جەهەننەمدا دەمێننەوەو لە ڕەحمەت و بەخشنی خووا مەحروم کراون، وە حەدیسیش لەو بارەوە زۆرن (حووابن بێپارێزێت لە کوفرو قەهری خۆیی). دوای

کوفرێ بە گوێرەی سەراحەتی ئایات وحەدیس لە مەنهییاتدا حەوتیان لە هەمویان گوناەترو تاوانیان لەباقی مەنهییات زیاترە، کە ناو براون بە (سەبعەی موبیقات یان موهلیکات). ئەو حەوتانەش ئەوانەن ١ـ شیرکە ٢ـ سیحرە ٣ـ قەتڵی بە ناحەقە ٤ـ ریبایە = سودە ٥ـ هەڵاتن لە سەفی غەزایە ٦ـ خواردنی ماڵی هەتیوانە بە ناحەق ٧ـ بوهتان بە ژن و ئافرەتی پاکە. جا لێرەدا لە پێشدا بەیانی ئەوانە دەکەم.

## (بەشی دوهەمی، مەنهییات، شیرکە واتە شەریک بۆ خووا، قەراردانە.)

(پرسیار) با بزانین یەزدانی مەزن لە قانونی دینی (قورئان) کە قانونی ژیانی ئینسانە، لەبەرچی (نەهی) لە شیرک کردووە و زیان و زەرەری شیرک چییەو بۆ کێیە؟ (وەڵام) زیان و زەرەی شیرک بە تایبەتی بۆ کەسێکە یان کەسانێکە ـ کە بیرو بڕوایان بەبونی خووا هەیە بەڵام هاوبەشی بۆ دادەنێن و عیبادەتی بۆ دەکەن و بەیارمەتی دەری خووایی حیساب دەکەن وە تکای یارمەتی لێ دەکەن و چاوەڕوانی چاکەیان لێی هەیە، ئەو شەریکەش وەکو: بوت ـ ئاگر ـ ڕۆژ ـ یان گاجوت و شیتی تر. یەزدانی مەزن بە توندی هەڕەشەی لێی کردووە و سەزای جەهەننەمی بۆ داناوە دیسان لێرەشدا سەرەتا لە دەلیل و بەڵگەی نەقڵی چاوەپۆشین و دەگەڕێینەوە بۆلای عەقڵ و هێژایی سەلیمی ئینسانی. (یەکەم) ئەگەر بەوردی تەماشا کەین و بیری لێ وەکەین بۆن ڕون دەبێتەوە کە هەر

خەزمەتکارێک ـ مودیرێک ـ فەرماندارێک کە لەلایەن ئەمیرێکەوە ژیانی تەأمین دەبێت. ئەگەر لە فەرمانی ئەمیرەکەی دەرچو بە تەواوی نافەرمانی کردو سەری بۆ نەیارو دژێوی ئەو ئەمیرە نەوی کردو پەیڕەوی لێ کرد. ئەمیرەکەی دەری دەکات و ژیانەکەی بە تەواوی لێدەبڕیت، جا خووایەک کە ئەو کەسەی لە دو قەترە ئاوی تێکەڵاو بوی داێک و باب لەماوەی نۆ مانگ یان زیاتردا کردۆیەتە بە خۆین و گێڕاویەتی بە گۆشت و ئێسقان و تەواوی بەشەکانی لەشی بۆ دروست کردووەو ڕوحی بەبەردا کردووە و هێناویەتە نێو دنیاو چاو ـ و گۆی و زوبانی داوەتێ و عەقڵ و هۆش و زانیاری پێ بەخشیوەو ماڵ و ژن و منداڵی داوەتێ و قانونی ژینی بەوەسیلە پێغەمبەران پێ ڕاگەیانداووەو بیرو هۆشی چاکەو خەراپەشی پێبەخشیوە. دەگەڵ ئەو هەموو چاکەیە ئەو عەبدە خوێڕیە ئەو (خالیق و مالیک و ڕازیقەی) حۆی دەگەڵ قانون و یاسای ڕاگەیانداروی نەناسێت شیاوی توندترین سەزایە و سەزاش دەبێ شیاوی عەزەمەت و گەورەیی خوابێت کە پیسترین و پڕئازارترین شوێنی جەهەننمە بۆ هەمیشە و دائیمی. (دوهەم) خاوەن مالێک لە گوندێکدا بێت دەبێ کوێخا، یان سەرپەرستی ئەو دێەو گوندە بناسێت یان لەهەر شارێکدا بێت دەبێ فەرمانداریان سەرپەرەستی ئەو شارە بناسێت و تابیعی یاساو قانونی بێت هەروایە دوڵەتیش بەڵام خووای خاوەن بەزەیی کە ئەو هەموو ئاسمان و مانگ و ڕۆژو ئەستێرە و ئەرزو ئاو و میلیاردها بونەوەری دروست کردووە، ئەو عەبدە چوروکە، نەی ناسیوەو شەریکی بۆ قەرار داوەو ناناسێ

(خالیق و مالیک و ڕازیقی) خوێی بەراستەقینە، لە دووای کوفریٚ گەورەترین تاوانە. (سێهەم) ئەگەر خووای ناسیوە بەڵام خووای تەعالی بەو هەموو عەزمەت گەورەییە کە عەقلی هەمو فیلسوفان لە کارو کردەوەی موتەحەیرە ئەو عەبدە شتیکی بیٚ ڕوح وەکو بوت و ئاگرو ڕۆژو شتی تر ـ یان حەیوانێکی هێناوەتە ڕیزی خوواو تاعەتی بۆ دەکات بۆیە شیاوی توندترین سەرایە. (چوارەم) بوت و ئاگرو ڕۆژ: یان حەیوانێک کە هیچ قودرەت و دەسەڵاتیکیان نییە چاوەڕی یارمەتیان لیٚ دەکات و بە شەریکی خووایان دەناسیٚ کە لە دووای کوفریٚ گەورەترین تاوانەو سەزای بۆ هەمیشە جەهەنمە. (پێنجەم) بەڵگەو دلیلی نەقلییە کە ـ یەقینی و بەرزتر لەمویان فەرمودەی خووایە، لە قانونی ژینی ئینسان (قورئان) النّساء = ١١٦دا فەرمویەتی **(إِنَّ اللهَ لا يَغْفِرُ أَنْ يُشْرَكَ بِهِ وَ يَغْفِرُ ما دُونَ ذٰلِكَ لِمَنْ يَشٰاءُ)** واتە بە حەقیقەت و ڕاستەقینە یەزدانی مەزن خۆش نابیٚ و نابەخشیٚ ئەو کەسانەی کە شەرێک بۆ یەزدان دادەنێن و خۆش دەبێت لە کەمتر لەشیرک بۆ کەسێک شیاوە و لیاقەتی بەخشینەکەی هەبێت).

(بەشی سێهەمی مەنهیّات سیحرە): سیحر بە نیشاندانی دیمەنێک دەگوتریٚ کە پێچەوانەی ڕاستەقینە و دور لە واقعی بێت وەکوو ئەوە گورسێک، تەناڤێک، بە(مار) نیشان بدات یان شتێکی بیٚڕوح وەکوو هێلکەیەک لەسەر دەستی دابنێت فەورەن بیکات بەدەعبایەک لەبەر چاوی کۆمەڵ کە پێچەوانەی عادەتییە بە تەواوی (شیاوی یاسەکە،

تەفسیری کەبیر مەجلەدی ٣ لاپەڕە ٢٠٢ تا ٢١٥) لە بەیانی ئایەتی / ١٠٢ بەقەرەدا، سیحرێ لەهەشت بەشداوە. تەفسیری (قـوطبی) مـجلەدی ٢ ص ٣٠ تا ٣٥ لە شازدە بەشدا بەیان فەرمووە) بەڵام لەو کـتێبە کـورتەدا ناکرێ بەیان بکرێت بە کورتی سیحر عیبارەتە لە کردەوەیەکی خەراپ و پێچەوانەی شەرعی کە خەڵکی پێ فریو بدات و چاوبەستی پێ بکات و خەڵکی پێ هەڵنێت بۆ کـاری خـەراپ و تـاوانکـاری و هـەلیاندیرێت. (پرسیار) با بزانین زیـان و زەرەی سیحر چییەو بۆ کێیە (وەڵام) زیان و زەرەدی بۆ ئەو کەسە، یان کەسانێکە سیحر دەکەن وە بۆ ئەو کەسانەشە کە بڕوای پێدەکەن و بەڕاستی دەزانن و لە ڕێگای حەق هەڵەدەبن زیـانی سێحرێ ئەوانەن (یەکەم) سیحر دەگەڵ ئیمان و ئیسلام ناکرێت ئینسانی سیحرباز لەبـەخشێنی خـوا بێبەشەو و سـەزای جـەهەننمە. (دوهـەم) کردەوەیەکی درۆیە و پێچەوانەی ڕاستەقینە و بەڕاستی بە خەڵکی نیشان دەدات کە تاوانێکە نەبخشەراو. (سێهەم) ئینسانێکی بێ‌تاوان فریو دەدات و ناحەقێکی بە حەق وە بەرچاو دەدات و هەلێ دەنێت بۆ کاری خەراپ و دور لە وێژدانی ئینسانی و دەیخاتە چارەڕەشی دنیا و پەسلان. (چوارەم) ئەو سیحربازە گەورەترین زوڵم لە نەفسی خوێ و ئەو کەسانە دەکات کە چاویان لەحەق دەبەستێ و دەیانخاتە نێو دەریای قەهرو غەزەبی خووا: کە سەزایان جەهەننمە. (پێنجەم) ئەو فریوخۆرانە پێیان وایە ئەو کارەی بەسەریان هاتووە یان دەی‌کەن حەقەو ڕاستە بەڵام پێچەوانەی حەقیقەتە و دُچاری قەهرو غەزەبی خووا دەبـن سـەزایـان جـەهەننمە. (شـەشەم)

دەلیلی نەقلی یە کە لە هەموویان یەقینی تر و گەورەتر فەرمودەی، یەزدانی مەزنە، لە سورەی (طه) = تاها = ئایەی / ٧٤ قورئاندا فەرمویەتی: (إِنَّا آمَنَّا بِرَبِّنَا لِيَغْفِرَ لَنَا خَطَايَانَا وَ مَا أَكْرَهْتَنَا عَلَيْهِ مِنَ السِّحْرِ) واتە: ئێمە ئیمانمان هێنا بە خووای وەدی هێنەرو بارهێنانی خۆمان بۆ ئەوە ببەخشێت هەڵە و تاوانی کردەوەی سیحرێ کە ئێمە مەنفور و دزێوی خووای خۆمان بوین بە هۆی کردنی سیحرێ، لێرەدا ڕون بۆوە کە ساحیر ئەگەر تەوبەی نەکات و نەگەڕێتەوە بە ڕاستەقینە بۆلای یەزدانی مەزن نەبەخشەراوە و سەزای جەهەننمە.

# بەشی چوارەمی
# مەنهییات قەتڵە بە ناحەق

قەتلێک کە خووا حەرامی کردووە نەبەخشراوە کوشتنی ئینسانێکە کە هیچ تاوان و حەقێکی بەسەرەوە نەبێت (پێویستە ئەوەش بزانین کوشتنی ئینسان لە بەعزێک شوێندا حەرام نییەو بەڵکو لازمە سەوابی هەیە. (یەکەم) چەتەو ڕێگر لە کاتێکدا ڕێگات لێ دەگرێ و دەیەوێ ماڵت لێ بستێنی. (دوهەم) کەسێک بە ناحەق دەیەوێ بتکوژیت و یەقینت وابێ ئەگەر ئەتۆ نەیکوژی ئەو دەتکوژێت. (سێهەم) دزێک شالاو دێنێت بۆ ماڵەکەت و دەیەوێ تالانت بکات و ماڵەکەت بەرێت. (چوارەم) پیاوێک ژنی هێناوە و زینادەکات ـ یان ژنێک مێردی کردووە زینا دەکات (زینا موحسەن) ڕەحم دەکرێن. (پێنجەم) ئینسانێک موسڵمانە و

کافر دەبێت و تۆبەش وەرناگرێت (موژتەد). (شەشەم) داگیرکەرێک دەیهەوێ ملکی شەرعی و حەقی واقعی تۆ دابگرێت یان، دای‌گرتووە، (دفاع لەحەق) (پرسیار) با بزانین قەتلی بە ناحەق زیان و زەرەی چییە. (وەڵام) (یەکەم) قاتیل ئینسانێکی کوشتووە وەکو خۆی ئاواتی پەرەدانی ژینی هەیە، ئەویش هەیەتی و لەو ژیانەی بێبەش و مەحروم کردووە. (دوهەم) ئینسانێکی کوشتووە کە عەبدی خوایە و خوا ماوەی ژین و مردنی بۆ داناوەو قاتیل بێ‌ئەمری خووای کردووە، کە بەر هەڵستی کاری خووا دەژمێردرێت و سەزای لێ وەردە گرێت. (سێهەم) ئەو کوژراوە هەروەکو هەموو ئینسانی‌تر موحیببەت و عیشق و عەلاقەی دەگەڵ ماڵ و منداڵی خۆی هەبووە و ئەو قاتیلە بێبەش و هێوا براوی کردووە. (چوارەم) ئەو قاتیلە ژن و منداڵ و کەس و وارسی ئەو کوژراوەی خستۆتە شین گریان و عەزابەوە. (پێنجەم) زۆر وایە کوژراوە کە ژن و منداڵی بچوکی هەن ئەو قاتیلە ئەو ژنە بێ‌تاوانەی لە مێردی خۆی بێبەش کردووەو ئەو منداڵە مەعسومانەی بێباب و سەغیر کردون. (شەشەم) زۆر وا هەیە کوژراوە کە هەژار و فەقیرە و ئەو قاتیلە بە هوی کوشتنی ئەو ئینسانە ژن و منداڵەکەی دوچاری سووال و گەدایی و هەزاران کاری سوک و دور لە ئینسانی کردون. (حەوتەم) زۆر وا هەیە کوژراوە کە پول و نەقدێکی زۆری هەیە و جودا لە خۆی کەسی‌تر ئاگادار نییە ئەو قاتیلە بە کوشتنی ئەو ئینسانە ئەو ماڵە زایع دەکات. (هەشتەم) زۆر کوژراو هەیە ماڵێکی زۆری لای خەڵکییە، یان زۆر بە خەڵکی قەرزدار و مەداریکش لەبەیندا نییە

قاتیل بە کوشتنی ئەو ئینسانە، حەقی ئەوی لەسەر خەڵکی، یان حەقی خەڵکی لەسەر ئەوی زایع کردووە کە تاوانی ئەو هەشت سوڕەتانە و هەزاران جورم و گوناهی تر کە لە عەقڵی بەشەر دورن و هەر خووا بۆ خۆی دەزانێت، بە ئەستۆی قاتیلی قەتڵی بە ناحەقەوەیە. (نۆهەم) تایفە و خزم و کەسانی کوژراوە کە دەبنە دوژمنی خوێنی قاتیلە کە و زۆر جاران هەڵدەکەوێ کە لەو دوژمنایەتیە هەزاران جۆین درژێت و میلیونها ماڵ زایع دەبێت. (دەهەم) بەڵگەو دەلیلی نەقلی کە لە هەموویان یەقینیترو گەورەتر فەرمودەی خووایە کە لە سورەی الأسراء ئایەی / ٣٣ (قورئان)دا فەرمویەتی: (وَ لا تَقْتُلُوا اَلنَّفْسَ اَلَّتِی حَرَّمَ اللهُ اِلاّ بِالْحَقِّ وَ مَنْ قُتِلَ مَظلُوماً فَقَدْ جَعَلْنا لِوَلِیِّهِ سِلْطاناً. فَلاٰ یُسْرِفْ فِي اَلْقَتْلِ إِنَّهُ کٰانَ مَنْصُوراً) واتە مە کوژن هیچ گیانێک کە خووا کۆشتنە کەی لەسەر ئێوە حەرام کردووە (اِلاّ) ئی للآ بە حەق نەبیت = واتە گیانێک کە تاوانێکی وای بە ئەستۆوە نییە کە شیاوی کوشتن بێت مەیکوژن. دوای ئەوە فەرمویەتی، کەسێک دە کوژرێت بە زوڵم و بە ناحەق بە حەقیقەت و ڕاستەقینە حەقی قیساس و تۆڵەن داوە بە وەلیە کەی کە لە تۆڵەدا قاتیلە کە بیکوژێت، دیسان یەزدانی خاوەن بەزەیی بەوەلی کوژراوە کە دەستور دەفەرموێت ئیسراف و زیادەڕەوی نە کات لە قیساس و تۆڵەدا بەوە کە خووا کۆمە کی پێکردووەو نەسرەتی داوە بۆ وەرگرتنەوەی قیساس و تۆڵە بەڵکو دەبێ هەر بە شێوەی کوژاوە کە قیساس و تۆڵە وەربگرێتەوە بەبێ زیادو کەم، چونکە هەر زیادەڕەویەک تاوانە. با قاتیل زۆر بەوردی بیر بکاتەوە کە خووا

کوشتنی وی واجب کردووەو ئەو زیانانەی ڕابردو هەموی لە ئەستوی وی هالاّوە. [بەشی پێنجەم، مەنهییات (ربا) ڕبایە] ڕبا زیادە وەرگـرتن و ناتەواوی لە موعاملەدایە چونکە کڕین و فرۆشتنی هەر جینسێک بەسێ شەرت دروست دەبێت. (یەکەم) تەساوی جینسە کەیە بۆ نمونە زێڕ بە فرۆش بەزێر کە عەیارەکەیان یەک بێت یان گەنمە سەردای بە گەنمە زەردەیان هەرقوت و نەقدێکی ڕایج دەبێ بەرابەرین بـە کـێشەو پـێوان ئەگەر یەکیان زیـا بێت پێی دە گوترێ (رباالفضل) واتە معاملە بە زیـادی تەرەفێک، وەکوو ئەوە پوتێک، گەنمە سەرداری دەفروشی بـە پـوت و نیوێک گەنمە زەردەیان، ئەنگوشتەریەک دەفرۆشی کـە مسـقالێکە بـە مسقاڵ و نێویک تەلاّ کە عەیارەکەیان یەکێکە ئەوا، ئەو موعامەلەیە بـەتاڵە، (دوهـەم) (حـلولە) واتـە دەبـێ هـەردوک تـەرەفی ـ فـرۆشراو کردراوەکە، حازربن، ئەگەر لایەگیان حازر نـەبێت پـێی دە گـوترێ ـ (رباالنّیساء) وەکو ئەوە پوتێک گەنمە سەرداری حازر بە پوتێک گەنمە سەرداری قەرز بفرۆشێت یان جینسێکی تر کە تەرەفێکی حازر نەبێت ئەو موعامەلەش بەتاڵە چونکە هەردوک لایـەنی مـوعامەلە کـە حـازر نـین. (سێهەم تقابض) جینسە کەیە واتە دەبێ فرۆشراوو کردراوەکە کە لەیەک جینسن‌و دەبێ وەریگرێن، وەرنا گـرێن و تـەسەرڕوف نـا کـرێن کـە پـێی دە گوترێ (ربالید) وەکوو ئەوە پوتێک گەنم دەفرۆشن بە بوتێک گەنم بەلاّم هیچکام گەنمە کە وەرنا گرن و لەمەجلیسە کە هـەڵدەستن و بـەلاّو دەبن، ئەو موعامەلەیەش بەتاڵ و حەرامـە چـونکە دوتـەرەفی فـرۆشراو

کردراوە کە وەرنەگیراوە، دوای ئەوە کە زانیمان شـەرتی (صحّەت بیع تساوی و حلول و تقابض) لە یەک جینسدایە (پرسیار) با بزانین زیانی ڕیبا چییە و بۆ کێیە،(وەڵام) ڕەزەرو زیانی ڕیبا بـۆ هـەردوک تـەڕەفی موعامەلەکەیە، ئەو دو بەشانەی دووایی زیانەکەیان ئەوەیە (یەکەم) ئەو لایەنەی وەرنەگیراوە ڵکرەکەوێ هەردەست نەکەوێ. (دوهەم) وادەبێ وەرنەگیراوەکە خەرابووە یان ئەرزیوەیان دزراوە، لەو حاڵانەدا زیان لە تەڕەف دەکەوێت. (سێهەم) ـ لەو حالانە نیگەرانی و ناکۆکی لەنێو دو تەڕەفی موعامەلەکەدا پەیدا دەبێت. (چوارەم) ئەگەر هەردوک لایەنی موعامەلەکە وەر نەگیرابێ دەگەڵ ئەو حاڵەتانەی پێشو، وا دەبێ یـەک تەڕەفی موعامەلەیان هەردوکییان پەشیوان دەبنەوەو بەزیانی تەڕەفێک یان بەزیان هەردوکیان تەواو دەبـێت دەکـەونە نـیزاع و کـێشەو هـەراو هەزاران زیان و فەسادی لێ پەیدا دەبێت.

زیانی بەشی یەکەم (ربافصل): (یەکەم) پێچەوانەی تـەواوی ئـەو قازانجانەیە کە لە بەیانی زەکاتدا، لە لاپەڕە ١٩وە دەست پـێدەکـات. (دوهەم) سەرمایە و ماڵی سوددەر، کەم دەبێتەوە کەم کەمە زیانی سود ـ دەرەکە زیاد ـ دەبـێت تـا وای بـەسەر دێ بـێماڵ دەمـێنێتەوەو لەتـینی برسیایەتی و هەژاری ماڵ و منداڵی توشی سواڵ و هەزاران کاری سوک و دور لە ویژدانی ئینسانی دەبێت. (سێهەم) سەرمایەی سود ـ وەرگر زیاد دەکات وکەم‌کەمە ئەو سەرمایە لەسەر یەک دادەنێت و دەیکات بە گەنج و، کەنز، وە هەزاران کاری خەراپی پێدەکات و بەهوی ماڵو سـەروەتی

زۆر هۆشی عەبدایەتی خووای نامینێت وشەیتان بەگوێرەی ئاواتی خۆی هەلێ دەسورێنێت و بە هیلاکی دەدات. (چوارەم) نیزامی (نظامی) تەبەقاتی ئینسان تیکدەچێت و فاسیلەی تەبەقاتی زۆر لێک وەدور دەکەوێت تاوای بەسەر دێت سەرمایەدار زۆر سەردەکەوێت و فەقیر و هەژار ـ زۆر دێتە خوارێ و سەرمایەدارەکان، هەژارەکان بەهۆیی ماڵی زۆرەوە ئەسیر دەکەن و دەیانکەنە عەبدو بەردەی خۆیان و بە ئەنواعی عەزاب و سوکی و چروکی و کاری بێ‌عیففەو دور لە ویژدانی ئینسانیان مەجبور دەکەن. (پێنجەم) دەلیل نەقڵی کە یەقینی‌تر لە هەمویان فەرمودەی خووایەکە یەزدانی مەزن لە سورەی توبە ئایە / ٣٤(قورئان)دا فەرمویەتی: (وَ الَّذِينَ يَكْنِزُونَ الذَّهَبَ و الْفِضَّةَ وَ لاٰ يُنْفِقُونَهٰا فِي سَبِيلِ اللهِ فَبَشِّرْهُمْ بِعَذٰابٍ أَلِيمٍ) واتە: ئەوانەی ئەوتۆ کۆ دەکەنەوە زێڕو زێو و لەسەریەکی دادەنێن و ئەیکەنە بەخەزنەو سەرفی ناکەن و بەلاوی ناکەنەوە لە ڕێگای خووادا. ئەی پێغەمبەر موژدەیان پێبدە بە عەزابێکی دەردهێنەرو زۆر سەخت. (شەشەم) لەباری ریبا دا فەرمویەتی لە سورەی بەقەرە آییەی / ٢٧٥ (الَّذينَ يأْكُلُونَ الرِّبٰو لاٰ يَقُومُونَ إِلاّٰكَمٰا يَقُومُ الَّذي يَتَخَبَّطُهُ الشَّيْطٰانَ مَنِ الْمَسِّ) واتە: ئەوانەی ئەوتۆ دەخۆن ریبا و سود، هەڵناستنەوە و قییام ناکەن لەکاتی ژیانەوەو هەستانەوەی قەبری بۆ حەشرێ یان بۆ هەستانەوەو قییامی کاروباری مەسالیحی دنیایە (إلاّ) ئی‌للا وەکو هەستانەوەو قییامی کەسێکی ئەوتۆیە کە شەیتان دەستی لێ وەشاندوەو مێچکی شلقاندوە هێزی جوداکەرەوەی نەماوە، واتە حۆل و

گێژ بووەو ڕێگای نەجات و ڕەزگاری لێ وەنبووەو سەرشێواوە لە ئاخیری ئایەتەکەدا دەفەرموێت خوای بەرزو بێهاوتا (**فَأُوْلَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ**) واتە: ئەوانە (ڕیباخۆرەکان) ڕەفیق و هەڤاڵی ئاگرن و لەنێو ئاگردا (واتە ئاگری جەهەنەم) دەمێننەوە بۆ هەمیشە و ئەبەدی.

(برای موسوڵمان و ئینسانی خاوەن عەقڵی سەلیم زۆر باش بیر بکەوە بۆ دنیایەکی کاتی کەپاش چەند ڕۆژ دەبڕێتەو دووایی دێ ژیانی هەمیشە و دووایی نەهاتوی پەسڵان (قیامەت) زایع و بە فیڕۆ مەدە، چونکە ئایەت و حەدیس زۆر لەبارەی ڕیباو سوددا وارید بووەوز یانی ڕیبا هەم بۆ شەخسی هەم بۆ جامیعە دور لە بژێرەیە و خۆیی لێ دور بکەنەوە).

# بەشی شەشەمی مەنهییات

# خوواردنیماڵی هەتیوانە

(پرسیار) با بزانین زەرەرو زیانی خوواردنی ماڵی هەتیوان چییە و بۆ کێیە (وەڵام) سەرەتا لە بەڵگەو دەلیلی نەقڵی چاوپۆشی دەکەین و دەگەڕێنەوە بۆلای عەقڵ و ویژدانی سەلیم (یەکەم) زۆر روناک و ئاشکارە (هەتیو) بەکسانێک دەگوترێ بابی پڕعیشق و ئەوینی خۆی لەدەست داوەو سێبەری پڕمێهرو موحیبتی بەخێوکەرو بارهێنانی خۆی لەقیس چووە. لێ قەڵماوی ئاوا، لەسەر هەمو ئینسانی خاوەن ویژدان و ناموس پێویستە یارمەتیان بکەن نەک ماڵیان بخۆن. (دوهەم) ئینسانێکی

لێ‌قەڵماو دڵێ پڕ لەغەمەو حوزن و پەرێشانی دایدە گرێت، تایبەت هەتیو و هەتیوباری لەهەمویان پەرێشان‌ترە بۆیە پێویستە لەسەر هەموو ئینسانی کامیل، ئەوانە دڵخۆشبکات و چاکەیان دەگەڵ بکات نەک مالیان تالان بکات بییانخاتە شین‌و گریان و پەژارەیان زیاتر بێت. (سێهەم) دەبێ هەموو ئینسانێک ئەوەندەی عەقڵ‌و شعوری هەبێت کە خووای مەزن هیچ ئیحتیاجیەکی بەوە نییە هێندێکیان فەقیر بکات و سووالێ بکەن‌و هێندێکشیان دەوڵەمەندو سەرماسیەدار بکات و دنیایەدا بگرن. بەڵام ئەو دنیایە، دنیای تاقیکاری و شێوەردی ئاخیرەتە و هەرچی لێرەدا بیچێنی خرمانەکەی لە ئاخیرەت‌دا وەردە گێڕێتەوە، مەبەست لەو نیزامەی فەقیری و سەرمایەداریدا ئەوەیە. ئایا فەقیرکە لە تەنشتی خۆیی دەبینی سەرمایەدارێک بەو هەموو عەزەمەتەو قودرەت و شەوکەتەوە داخوا لە خوواو لە فەقیریەکەی خۆی ڕازییەو لەسەر ئەو ژیانە تاڵ و تاریکە شوکرانە و سوپاسی خووا دەکات یان پێچەوانەیە. دیسان سەرمایەدارێک کە بەو هەموو قودرەت و دەسەڵاتەی کە بۆی کۆ بۆتەوەو لە ئی‌ختیاری‌دایە دەبینی لەبن دەستیدا ئینسانێک یا ئینسانهایەکی فەقیرو ڕوت‌و برسی‌و لێ‌قەڵماو کە هیچ پێویستیەکی ژینیان نییە ئایا بەزەیی بەوانە دێ‌و کۆمەک و یارمەتیان دەکات یان پێچەوانەیە هەڵوێستی ئەو بەحسە شیاوی لێ کۆڵینەو بەیانێکی زۆرە بەڵام بەداخەوە لەو کتێبە کورتەدا بۆم ناکرێت بە کورتی فەقیر بە دەوڵەمەندو دەوڵەمەند بە فەقیر، بیرو کردەوەیان ڕون دەبێتەوە جاخۆ (هەتیو) لە هەمو فەقیرێک زیاتر

شوێنی چاوەدێریە کەوا ئەدەبێ کۆمەکی پێ بکرێت نەکوو ماڵی بخورێت.

(چـوارەم) بـەڵگەو دەلیلی نـەقلیەکـە لە هـەموویان یـەقینیترو سەحیحتر فەرمودەی یەزدانـی مـەزنە لە سـورەی (أنـعام ئـایەی / ١٥١ قورئان)دا فەرمویەتی: (**وَ لاٰ تَقْرَبُوٓا مٰالَ اَلْيَتِيمِ إِلاّٰ بِالَّتِي هِـىَ اَحْسَـنُ**) واتە: ئێوە نێزیکی ماڵی هەتیوان مەکەون مەگەر بە چاکە. لەو ئایەتەدا دەردەکەوێ کە بە هیچ عنوانێک توشی ماڵی هەتیوان مەکەون ئیللا بە چاکە نەبێ، نیزیکی مالی هەتیو بە چاکەش ئەوەیە سەرپەرستی مالەکەی بکرێت کە لێی زایع نەبێت وەکوو ئەوەکە حەیوان و پاتاڵی هەیە شوانی بو بگرێت و ئاگاداری بکرێت یان ملک و باغی هەیە کاسبکاری بۆ بگرێت و بەهرەو حاسلێ لێ وەر بگرێت و زەرەرو زیان بە هەتیو نەکات.

ئایەت و حەدیسی زۆر لەبارەی هەتیوا هەن کە لێرەدا ناکرێت بەیان بکرێن.

## بەشی حەوتەمی مەنهییات

## پشتکردنەوەو هەڵاتنە لە غەزایە

غەزا، واتە شەڕکردن و گیان فیداکردنە بۆ تەرەقی و پەرەپێدانی قانون و یاسای خووا بە نیەتێکی خالیس بۆ ڕەزائیەتی خوواو بەرگری لە کزیو بێهێزبونی دینی بە حەققی ئیسلام. (پرسیار) با بزانین زیانی و زەرەری هەڵاتن لە غەزایە چییە و بۆ کێیە (وەڵام) ژیانی هەروەکو بۆ هەڵاتوەکەو لشکری ئیسلامی هـەیە، بـۆ دیـنی ئـیسلامیش زیـانی زۆرە لە پێشدا

دەگەڕێنیەوەو رو دەکەینە بەڵگەو دەلیلی عەقڵی سەلیمی ئینسانی. (یەکەم) زۆر ئاشکرایە و حەتتی منداڵیش ئەوە دەزانن کە هەلاّتن سوکی و چروکی و ترسەنۆکی هەلاّتووە کە دەگەیەنێت، تایبەت کە هەڤالاّن بەجێی بیلێت و لەنێو لشکری ڕاکات. (دوهەم) هەلاتن: غەم و پەژارەی بە جێماوەکان زۆر دەکاتو دەکەونە دڵەخورپەو ترسو گومان ڕویان تێدەکات و لە غەزایە کە سست و بێهێز دەبن. (سێهەم دوژمن) تێدەگات کە تەرەفی بێهێز بووە و غیرەتی بەرابەری کەم بووە، غیرەت و شەهامەتی زیاد ـ دەبێت و زیاتر لەپێشو هەڵمەتو شالاّو دەکات. (چوارەم) سەفی غەزا و لشکری ئیسلام زۆرجاران بەو هۆیەوە کزی بەسەردا هاتووە پەرێشان بووە. (پێنجەم) بەو هۆیەوە زیانی زۆر بەدین دەگات و دینی پێشکست دەبێت. (شەشەم) کەسێک یان کەسانێک دەبنە هۆیی شکستی دین تاوانیان گەورەو نەبەخشەراوە. ئەگەر بەڕاستی نەگەڕێنەوە بۆلای خووای خاوەن بەزەیی. (حەوتەم) دەلیلی نەقلییە، کە یەقینیتر لە هەمویان فەرمودەی یەزدانی مەزنە کە لە سورەی (فتح آیەی / ١٦ قورئان)دا فەرمویەتی: **(قُلْ لِلمُخَلَّفِينَ مِنَ الأعْرَابِ سَتُدْعَوْنَ إلىٰ قَوْمٍ اوُلي بَأْسٍ شَدِيدٍ تُقَاتِلونَهُمْ اَوْ يُسْلِمُونَ (١) فَإنْ تُطِيعُوا يُؤْتُكُمُ اللهُ اَجْراً حَسَناً (٢) وَإنْ تَتَوَلَّوْكَمَا تولَّيْتُمْ مِنْ قَبْلُ يُعَذِّبْكُمْ عَذاباً اَليماً (٣))**. واتە: بڵێ و ڕوناک ڕابگەیەنە: ئەی پێغەمبەرﷺ لەبۆ ئەو موخالیفانە لە عەرەبان لەوە بەدوواوە بانگدە کرێن و دەخوازێن بۆ بەرابەری و شەڕکردن دەگەڵ قەومێکی زۆر بەغیرەت و شەجیع و بەهێز، بۆ ئەوە یان دەیانکوژن و

مەحویان دەکەنەوە یان موسوڵمان دەبن و قانون یاسایی خووا قبوڵ دەکەن (١) ئەگەر ئیتاعەیان کردو بەو بانگەوازو دەعوەتەوە هاتن جیهادەکەیان تەواو کرد خووای خاوەن کەرەم خەلات و یارمەتیکی زۆریان پێ دەبەخشیت (٢) (لە دنیایەدا غەنیمەت و ماڵێ کافرانەو سەرکەوتن و دەسەڵات وەدەست هینانە و بە ئاوات گەیشتنە و لە پەسلانیش بەهەشتە بو هەمیشە) وە ئەگەر ڕویان وەگێڕاو لەو دعوەتە سەرپێچیان کردو لەو مەیدانە هەلاتن وەکو لە پێشدا ملیان باداو هەلاتن، ئەوە عەزاب و سەزا دەدرێن بە عەزابێکی زۆر توندو دەردهێنەرکە ئاگری جەهەننمە (بۆیە هەلانێ لە سەفی غەزایە گەورەترین بەلایە).

## بەشی هەشتەم لە مەنهییات
## قذف محسنات

واتە: بوهتان و ئیفتیرا بەو ژنانە کە پاک و بێ تاوانن، (پرسیار) با بزانین بوهتان زەرەرو زیانی چییە و بۆ کێیە (وەلام) سەرەتا بەلگەو دەلیلی عەقڵییە. (یەکەم) بۆهتان پێوەلکاندو لەمل پێچانی شتێکە بە شەخسێکەوە کە ئەو شەخسە پاکە لەو شتەو بێئاگایە واتە خەراپتر لە درۆیە خۆ زۆر ـ ڕوناکە درۆ بۆ ئینسانی خاوەن ویژدان سوکیو چروکیە کی زۆر. ئەگەر بە ئینسانی باشە ڕافەت بگوتری درۆزن زۆری پێناخۆشەو زۆر نێزێکە شەڕێ بکات. (دوهەم) ئەوکەسەی ئەو بوهتانەی پێدە کرێت بە گویی دەگاتەوەو زۆر قەڵس تورە دەبێت زۆر جاران شەڕی لێ پەیدا

دەبێت و زیانی ماڵیو کوشتاریێ دە کەوێتە نێوو خۆ ئە گەر شەرو هەراشی لێ پەیدا نەبێت ئەو ئینسانە دلێ دیشێتو دلئیشاندنی ئینسانی بێتاوان گـوناهی گـەورەیە. (سێهەم) ئـەو بـوهتانکەرە تـوهمەتی زینای بـە ئافرەتێکەوە داوە کە ئەو ئافرەتە پاکو بێئاگایە و زوجار هەڵکەوتووە لەسەر ئەو جۆرە توهمەتانە خوێنڕێژی و کوشت و کۆشتار هاتۆتە نێوان. (چوارەم) بەڵگەو دەلیلی نەقڵییە کە یـەقینیتر لە هـەمویان فـەرمودەی خووایە کە لە سـورەی (النـور آیـەی / ٢٣ قـورئان)دا یـەزدانـی مـەزن فەرمویەتی: (اِنَّ الَّذين يَرْمُونَ اَلْمُحْسَنَاتِ اَلْغَافِلاَتِ اَلْمُؤْمِنَاتِ لُعِنُوا فِي الدُّنْيا وَ اَلآخِرَةَ وَ لَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ) بە حەقیقەت ئەوانەی ئـەو تـۆ کـە بوهتان دە کەن و دەیهاوێنە سەر ئەوژنانەی پاک وبێئاگاو خاوەنی ئیمانی ڕاستەقینەن و دورن لەو توهمەتە حەواڵە کراوە، لەعـنەتیان لێ کـراوە و بێبەشن لە ڕەحمەتی خووا ـ لە دنیا (کە سوکو چروکو بێئابڕو دەبن) و لە پەسلاّن (قیـامەت)دا لەبۆ ئەوانە دیاری کراوە عەزاب و ئازارێکی زۆر گەورە کە ئاگری جەهەننمە. لێرە دا ڕون بووە کە بوهتان چاڵە ئاگرێکە، دەبێ خۆی لێ بە پارێزیت و خۆتی پێ سوتێنی وە هەر وە کوو لە پێشەوە باسکرا ئەو حەوتانەی دووا کوفرێ ناوبراون بە (سبعەی موبیقات) هیلاک دەهەندەن و شیاوی ئەوەن زۆر بە وشیای خوریانی لێ دور بخەیەوە.

# بەشی نۆهەمی مەنهییات
# أرتداد

واتە کافر بونەوەو دووای ئەوە کە موسڵمان بووە خۆی کـافر بکـات (پرسیار) با بزانین زیانی، أرتیداد، چییەو بۆ کێیە، (وەڵام) زەرەدو زیانی بۆ ئەوکەسەیەکە (مورتەد) دەبێ و خۆیی کافر دەکات و جورم و تاوانی لە کافری ئەسڵی زیاترە، لێرەشدا لە پێشدا بۆ عەقڵی سەلیم و ویژدانی پاکی ئینسانی دەگەڕێینەوە. (یەکەم) ئینسانێکی کوێری مادەرزادی کە هەرگیز کورەی ڕۆژی نەدیوە، دەڵێ ڕۆژ نییە ڕۆناکە درۆیە، ئینسانێکیش هەیە ساغ و سـەلیمە و کـورەی ڕۆژی دیـوەو هـەموو ڕۆژێـک، لەبـەر تـاوو ڕوناکایی ڕۆژێ کاری کردوەو دەڵێ ڕۆژ نییە. ئەویش درۆیە، بەڵام درۆی چاوساغە کە گەورەترە. ئەوە هەموو منداڵیش دەزانن. هەروایە مورتەدیش دەگەڵ کافری ئەسڵی کافری ئەسڵی خووای بە تەواوی نەناسیوەو قانون و یاسایی خووای نەدیوە یان بڕوای پێی نەبووە وە شوێن ڕەسـەنی خـۆی کەوتووەو کافرە. بەڵام ئینسانی موسوڵمانی أسڵی یان موسوڵمان بووە لە حاڵێکدا خووای ناسیوەو قانون یاسای خووا فێر بووەو دوایی کافر بووە = ڕوناکە تاوانی گەورەترە و سەزای زۆرتر دەبێت. (دوهـەم) ئـەو پێنج بەڵگەو دەلیلانەی کە بۆ کوفرێو ئەو پێنجانەی بۆ شیرکێ لە پێشەوەدا لەو کتێبەدا بەیانکران بە توندترین سەزاوە شامیلی: مـورتەدیش دەبـن، کـە

لێرەدا پێویست نیە دوبارەیان بکەمەوە بە وردی چاویان لێ بکەن.
(سێهەم) بەڵگەو دەلیلی نەقڵییە کە لە هەمویان یەقینی‌ترە فەرمودەی یەزدانی مەزنە کە لە سورەی (البقره آیەی / ١١٧ قورئان)دا فەرمویەتی:
**(وَمَنْ يَرْتَدِدْ مِنْكُمْ عَنْ دِينِهِ فَيَمُتْ وَهُوَ كَافِرٌ فَأُولَٰئِكَ أَصْحَابُ النَّارِ هُمْ فِيهَا خَالِدُونَ)** واتە: کەسێک لە ئێوە لە دینی ئیسلامی خۆی وەر بگەڕێتەوە بۆ کوفرێ و لەسەر ئەو حاڵەتە بمرێت ئەو کەسە کافرە ئا ئەو ئیسانانە بە فیرۆیانداوە کردەوەی خۆیان لە دنیاو قیامەتداو ئا ئەوکەسانە ڕەفیقی ئاگری جەهەنمن و لەوێدا دەمێننەوە بۆ هەمیشە و دائیمی ئەوە سەریحی دەقی ئایەتەکەیە (بەڵام بەلای هێندێک لە زانایانی بڕوا پێکراوی دین فەرمویانە: وەکوو عەللامەی قرطبی لە تەفسیرەکەی مجلەدی ٣ ص ٢٨، مورتەد ئەگەر تویەیەکی بە ئیخلاسی بکات بەڕاستی بگەڕێتەوە بۆ ئیسلام لە حوکمی ئەو ئایەتە ڕەزگاری دەبێت‌و تۆبەی لێ‌وەر دەگرێت و بەلای هێندێکی‌ترەوە کە حەزرەتی ئیمامی شافیعی ﷺ دەگەڵ ئەوانەیە فەرمویانە مورتەد دەکوژرێت و لە ژێر حوکمی ئەو ئایەتە دەرناچێت. خووا بە ڕەحمی خۆی لە ئیرتیداد بیمان پارێزێت.

# بەشی دەهەمی مەنهییات

## زینا موحسەنە

زینا موحسەن ئەوەیە پیاوێک ژنی هێناوە یان ژنێک چۆتە لای مێردی و زینا دەکەن (بەڵام پیاوێک ژنی نەهێناوە یان کچێک نەچۆتە لای مێردی بۆ ئەوەڵین جار، زینا دەکەن ئەوانە سەدداری حەدیان لەسەرەو داخیلی ئەو حوکمە نین). (پرسیار) با بزانین زیانی زینا چییە و بۆ کێیە؟ (وەڵام) زیانی زینا بۆ ئەوکەسەیە زینا دەکات. دیسان لێرەشدا دەگەڕێنەوە بۆلای عەقڵیسەلیمو وپژدانی پاکی ئینسانی. (یەکەم) زۆر بەوردی فکر بکەینەوە بە حەقیقەت سەرنج بدەن بونەوەری زیندو و خاوەن جوڵانەوە دوبەشە، (بەشی یەکەمی) بێعەقڵ و بێزوبانی بەیانە (بێعەقڵ و بێنوتقە). (بەشی دوهەمی) خاوەنی عەقڵ و زوبانی بەیانە (عاقڵ و ناتیقە). بەشی ئەوەڵی سایری حەیوان و پاتاڵە و هیچ تەکلیفێکی دینییان لەسەر نییە. وەدیهێنەر قانون یاسایەکی لەسەر ئەوانە فەرز نەکردووە. بەڵکو هەرچی دەستیان کەوت و پییان خوشبو دەیخۆن و هەرچی بۆیان ڕاوەستا سواری دەبن و یان خۆیانی تەسلیم دەکەن. بەشی دوهەمی ئینسان و ئەجیننە و مەلائیکەن ـ کە مەبەستی ئێمە ئینسانە، ئینسان خاوەنی عەقڵ و زانیارییەو، خاوەنی قانون و یاسایە کە (خالیق و مالێک و ڕازیقی) خۆی یەزدانی مەزن واجبی کردوە لەسەریو ئەگەر ئەو قانون

و پاسایە پێک نەهێنێت (ئەو خالیق و مالیک و ڕازیقەی خۆی سەزای توندی لێ وەردە گرێت) پاش ئەوە پێویستە زۆر بەوردی بیر لە گەورەیی ئینسان و بچوکی و چروکی حەیوان و پاتاڵ بکەیەنەو لێکی بدەیەنەوە ئەگەر ئینسان خۆی لەو هەموو گەورەیی و شەڕافەتە خارج بکات خۆی بکاتە هاوبەشی پاتاڵ و هەرچی پێی خۆش بێت بیخوات و هەرچی بۆی ڕاوەستا سوری بێت یان خۆی تەسلیم بکات زۆر لە پاتاڵ کەمتر دەبێت چونکە پاتاڵ سەزای دوایی نییە بەڵام ئینسان تولەو سەزای هەیەو پێشی ڕاگەیەندراوە (پرسییار) با بزانین ئەوە کە ئینسان خۆی دە کاتە هاوبەشی پاتاڵ و ئەوشتانەی تایبەتی ئینسانن وەلای دەنێن و ئەشتانەی تایبەتی پاتاڵە قبوڵی دەکەن زیانی چییە. (وەڵام) (یەکەم) یەزدانی مەزن لە سورەی (الأسراء / ٧٠)دا فەرمویەتی (وَ لَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي ئَادَمَ) واتە بە حەقیقەت و ڕاستەقینە بەخشیونە ڕێزو گەورەیی بە ئینسان، ئەو ئینسانە ئەو هەموو ڕێزو گەورەییەی فریداوەو خۆی کردۆتە هاوبەشی پاتاڵی سوک و چروک. (دوهەم) یەزدانی مەزن لە سورەی الرّحمٰن ئایەی ٣ ـ ٤ فەرمویەتی: (خَلَقَ ٱلْأَنسانَ عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ) واتە: خەڵقن کردووە. ئینسان و لە نەبونەوە هێناونەتە بون و فێری بەیانن کردووە. وە کوو تەفسیری قورطبی مجلّدی ١٧ ص ١٠٠ نوسیویەتی: بەیان هەموو قانون و یاسایی دینی دە گرێتەوەو زۆریش ڕوناکە هەمو ئینسانێکێ موسوڵمان قانونی دینی. پێ ڕاگەیاندراوە عەقڵی چاکەو خەراپەی هەیە، دە گەڵ ئەوەش ئەو ئینسانە شانازی و پیرۆزی زانیاری لە خۆی فڕێداوەو خۆی کردوتە

هاوبەشی پاتاڵی سوک و چروک. (سێهەم) یەزدانی مەزن لە سورەی (والتین ئایەی ٤) فەرمویەتی: (لَقَدْ خَلَقْنا الْاِنْسانَ في اَحْسَنِ تَقْويمٍ) بە ڕاستەقینە ئێمە ئینسانن خەلق کردووەو وەدینهێناوە لە جوانترین دیمەن و قیافەدا. هەرچەند ئەو کتێبە زۆر کورتە جێگای بەیانی زۆری نیە بەڵام بە پێویستم زانی ئەو بەیانەی تەفسیری = قورتبی (قرطبی) بە نەقڵ لە = أبن عەرەبیەوە (أبن عربی)یەوە لە مجلّد / ٢٠ ص ٧٧دا بەیان بکەم. یەزدانی مەزن ئینسانی خەڵق کردووەو ئەو نیعمەتانەشی پێداوە: **١ـ زیندووە ٢ـ زانیارە ٣ـ هێزو توانایی هەیە ٤ـ عەقڵی هەیە ٥ـ أیرادەی چاکە و خەراپەی هەیە ٦ـ هێزی نوتق و بەیانی هەیە ٧ـ هێزی بیستنی هەیە ٨ـ هێزی دیتنی هەیە ٩ـ هێزی جوداکردنەوەی خێرو شەری هەیە. ١٠ـ هێزی جوڵانەوەی هەیە ١١ـ بە پێوە دەڕوات.**

واتە: (ئەشرەفی مەخلوقاتە) لە زەمانی خەلافەتی (منصور عباسی)، عیسی، کوڕی موسیٰی هاشمی ژنێکی هەبو زۆری خۆش دەویست و ئەوینی زوری هەبو، ڕۆژێک ژنەکەی لە بەرابەری ڕاوەستابو گوتی هەرسێکە تەڵاقم کەوێ ئەتۆ لە مانگێ جووانتری. ژنەکە گوتی: تەڵاقت کەوتن‌و لەبەر دەستانی هەڵات و خۆی ونکرد. عیسی، زۆر ناڕەحەت و پەرێشان بو ڕۆینی بۆ دەرباری (منصور عباسی) ڕوداوەکەی بۆ گێرایەوەو منصور زانای وەڵاتی کۆکردەوەو هەمویان بڕیاری کەوتنی تەڵاقەکەیاندا. بەڵام یەک نەفەر لەوانە بێدەنگ بۆ (منصور) ڕوی تیکردو گوتی ئەتۆ بڕیارت چییە وەڵامی داوە ئەو تەڵاقە نەکەوتوە، چونکە خووا فەرمویەتی

ئینسانم دروست کردووە لە جوانترین شێوەدا (سورەی والتین) بۆ خوێندنەوەو هەمویان قبوڵیان کرد. مەبەست ئەوەیە ئینسان جوانترین و شیرین‌ترین مەخلوقی خوایە. (چوارەم) نەتیجەی زینا: ١ـ ئەولادێکە لەنێو جامیعەدا سوک و چروکەو بە زۆڵ ناو دەبرێت ٢ـ لە کەس میراتێ ناگریت ٣ـ نەسەبەی نیەو رەسەنی ناچێیەوە سەرکەس ٤ـ ئەو ئینسانە بێ کەس و بێ‌نەسە دەبێت بێ گوناە و بێتاوان لە تەواوی ژینیدا کزو سەرشۆڕو خەجاڵەتی نێو جامیعە بەسەر دەبات. با لێرەدا زۆر بە وردی سەرنجی ئەوندە نوسراوە بدەین کە کە دەنگێک لە دەریایەکەو ویژدان و عەقڵی سەلیم بکەینە قازی ئینسانێک ئەو هەمو کەرامەت و عەزەمەت و زانیاری و جوانی بەهەمو بەشە ناکانیەوەو عەقڵ و حەیاو شەرمو ویژدانی ئینسانی وەلابنێت خۆی بکاتە هاوبەشی پاتاڵ و حەیوانی وەحشی، هەرچی دەستی کەوت و پێی خۆشبو بیخوات و هەرچی بۆی راوەستا سواری بێت یان هەرچی سورای بو بۆی راوستێت و خۆی دەبەرکات دەبێ سەزای چەبێت، موسوگەرە سەزای پیسترین‌و، توندترین و شەرماوەرترین عەزابە کە = رەجمە هەر لەو دنیایە لەبەر چاوی کۆمەڵ (رەجم ئەوەیە کە چاڵێک هەڵدەقەندرێت و ئەو زیناکەرەی دەنێو دەخەن وە بەردەبارانی دەکەن کە مەساحەتی چالەکەو میزانی بەرد بارانە کە لە شەرعدا لە باسی زینادا بەیان کراوە کە لێرەدا جێی نابێت) (پێنجەم) دەلیل نەقڵیە کە لە هەمویان یەقینی‌تر فەرمودە خوایە کە لە سورەی (الأسراء آیەی / ٣٢)دا یەزدانی مەزن فەرمویەتی: (وَ لاَ تَقْرَبُوا الزِّنَا إِنَّهُ كَانَ

فاحِشَةً وَ ساءَ سَبيلاً) واتە: ئێوە توشی زینا مەبەن و نێزیکی زینا مەکەون چونکە بەڕاستی زینا کردەوەیەکی ئابڕوبەرەیەو شەڕافەت و کەرامەت و پیرۆزی ئینسان لادەبات و پیسترین ڕێگایە (بۆ هەموو جۆرە فەسادێک) یەزدانی خاوەن بەزەیی بمانپارێزت لەهەر کردەوەیەکی پیس.

# بەشی یازدەهەمی مەنهییات
# (لواطە)

لیواتە، واتە، نێربازی، کە پیشەی قەومی لوتە (لوط) لیوات هەر زینایە بەڵام لە زینا سەزای پترو زیاترو سەنگین‌ترە چونکە هەروەکو ئەو زیانانەی بۆ زینایە هەن بۆ لیوات‌یش هەن و زیاد لە زیناش. (یەکەم) ژن مەحەللی (وەتئە) جیماعە = بەڵام پیاو مەحەللی جیماع نییە. (دوهەم) پیاوی (حیز) لە ژنی (حیز) زیاتر شەڕافەت و پیرۆزی ئینسان دەشکێنێت و نەنگ و دەنائەتی زیاترە. (سێهەم) هەروەکو زیناناوی پاک و پیرۆزی ئینسانی زایع دەکات و بەفیڕۆ دەچێت. واتە. لیوات و نێربازی لە هەموو بارێکە لەمێبازی خەراپترە و پیسترە و سەزای زۆرترە.

# بەشی دوازدە،سێزدەی مەنهییات
# (دیاثة)، دییاسەت و (قیادة) قییادەتە

دییاسەت یان، دەییوس، بە کەسێک یان کەسانێک دە گوترێ کە ماڵ و منداڵی خۆیان سازدە کەن بۆ زینا، یان ئاگاداری پیشە زینای ماڵ و منداڵی خۆیانن و پێی ڕازین. قییادەت بە کەسێک یان کەسانێک دەڵێن کە ژن و منداڵی خەڵکی (غەیری خۆی) ساز دە کەنو واداریان دە کەن بۆ زینا. ئەو دووانەش بە پیاوی زیناکەرو ژینی زیناکەر دەژمێردرێن بە گۆیرەی ئەو حەدیسە پیرۆزە: (**اَلّدٰالُّ عَلىٰ خَيْرِهِ كَفٰاعِلِهِ وَ الّدٰالُّ عَلىٰ شَرِّهِ كَفٰاعِلِهِ**). تەواوی ئەو تاوان و سەزایەی کە بۆ زیناکەر، دییاری کراوە، بۆ دییوس و قییادەش شامیلە و بەوردی تەماشای بەڵگە و دەلیلی زینا بکرێت بو، (لیوات، دیاثة و قیادة) لێرەدا پێویست نییە دوبارە بکرێنەوەو زییاد لەوانیش یەزدانی مەزن لە سوڕەی (التّحریم آیەی / ٦)دا فەرمویەتی: (**يٰا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا قُوا أَنْفُسَكُمْ وَ اَهْلِيكُمْ نٰاراً**) واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئەوتۆ خاوەنی ئیمانن بە پارێزن و دور بخەنەوە خۆتان و ئەهل و نێزیکانی خۆتان لە ئاگری، جەهەننەم، ئەوانەی، لیوات و دیاثە و قیادە و زانین، خۆیان و ماڵ و ئەهلی خۆیان و غەیری خۆشیان ڕاکێشاوە بۆ پیسترین تاوان و توندترین سەزای خالیق و مالیک و ڕازیقی خۆیان هەمو بونەوەران.

# بەشی چواردەهەم لە مەنهییات
# خواردنەوەی شەڕاب و ئەوشتانەیە
# کە ئینسان بێهۆش دەکەن وەکو شەڕاب

وەکوو ئارەق و شەڕاب و بەنگ و تریاک و هیرۆین و غەیرە:
(پرسیار) با بزانین خواردنەوەی ئەوشتانە ئینسان بێهوش دەکات (مُسکِر) چییەو بۆ کێیە؟ (وەڵام) زیانی بۆ ئەو کەسەیە مەست دەبێت. (یەکەم) عەقڵ و هۆش کە سەرمایەی ئیدارە کردنی تەواوی ئیش وکاری پێویستی ژیانی بەشەرن لا دەبەن هەر ئینسانێ کە مەستبو لە حاڵی مەستیدا عەقڵ و هۆشی دەڕوات و بیری چاکە و خەراپەی نامێنێت. عەقڵ کە پادشای نیروی بەنی ئینسانە لەقیسی دەچێت. (دوهەم) زۆر جار لە حاڵی مەستیدا توشی زینا دەبێت و چارەڕەشی ئەو تاوانە گەورە دەبێت کە لە بەیانی زینادا ڕابرد. (سێهەم) زۆر جار لە حاڵی مەستیدا توشی شەڕو قەتلێ دەبێت و نگبەتی ئەو تاوانە گەورەی دێتەسەر کە لەیانی قەتلێ ڕابرد. (چوارەم) زوربەی ئەوکەسانە کە موعتادن نیروی بەدەنیان کزو لاواز دەبێت و لەرزۆک و فەلەج دەبن لە درێژماوەدا. (پێنجەم) هەمو موعتادێک سەرف و خەرجێکی زۆری دوێت و زۆر هەڵدەکەوێت بێماڵ و سامان دەمینێتەو ماڵ و دارائی لەدەست دەڕوات و فەقیر و نەدار دەبێت توشی سواڵ و هەزاران کاری بێناموسی دەبێت. (شەشەم) بەڵگەو دەلیلی

نەقڵی کە لە هەمویان یەقینی‌تر فەرمودەی یەزدانی مەزنە کە لە سورەی (المائدة آیەی / ٩٠)دا فەرمویەتی: (**يٰا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمرُ وَ الْمَيْسِرُ وَالْأَنْصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُم تُفْلِحُونَ**) واتە: ئەی ئەو کەسانەی ئەوتۆ ئیمانو هەیە بە خـوا قـانون و یاسای خووا، بەڕاستەقینە و حەقیقەت شەڕاب و هەموی ئەو شتانە ئینسان مەستدەکەن، وە هەموی ئەوشتانە کە قوماریان پێدەکرێت وەکو پـەرو نەردو غەیرە و هەموی ئەوشتانە کە دادەنرێن بۆ عیبادەت‌پرستن، وەکـو بوت‌و سەنگ‌و دیمەن‌و غـەیرە، و هـەموی ئـەوشتانە بـەخت‌ئازمایی و فاڵیان پێدەکرێت وەکو ـ قورعە و چلدانەو دیمەنی ئـەستێرە و غـەیرە، پیسن‌و کردوەی شەیتانن و دوری‌یان لێ بکەن و نەفیان بکەن بەڵکو ئێوە لە سەزاو عەزاب ڕەزگار بن (تەفسیرە بەرزەکان وەکو ـ طبری ـ کـبیر ـ قرطبی لەبارەی ئـەو ئـایەتەدا بـەیانێکی زۆر دورو درێـژیان هـەیە کـە هیوادارم چاویان لێ بکەن) شـیاوی بـاسە ئـەوانـەی (مـوادی مسکـر) دەفروشن و موعامەلەی پێ دەکەن هاوبەشی شەڕاب‌خۆرن.

## بەشی پازدەهەم لە مەنهییات
## قومارە (اَلْمَيْسِرُ)

قومار لە زۆربەی زیانەکاندا وەکو، مەستی، وایە چونکە هەروەکو مەستی بیروهوش لەهەمو قازانج و زیانێک دەبرێت قـومارکەریش بـە قومارەکە سەرگەرم دەبێت و بیرو هۆشی لە هەموو قازانـج و زیـانێک

دەبڕێت تەنها لەسەر قومارەکەی ساغ دەبێتەوە و پێیەوە (دەبەسترێتەوە) (پرسیار) با بزانین زیانی قومار چییەو بۆ کێیە (وەڵام) زیانی قومار بۆ کەسێکە یان کەسانێکە، قومار دەکەن.(یەکەم) بەقومارەکەیەوە سەرگەرم دەبێت هۆشی لە هەموو قازانج و زیانێک دەبڕێت. (دوهەم) قوماری، هەروەکو مەستی شەڕاب بیری خوواو تاعەت و عیبادەتی خۆوای لا نامێنێت. (سێهەم) قوماری هەروەکو شەڕابی، لەسەر قوماریٚ توشی شەڕو هەرا دەبێت و زۆر جاران برینداریان دەکوژرێت یان دەکوژێت و بریندار دەکات و توشی زیندان و سەزای واقورسی قەتڵ دەبێت کە ڕابرد لەو کتێبەدا. (چوارەم) قوماری زۆر جار، دەدۆڕێت دوچاری زەرەرو زیانی زۆر دەبێت زۆر هەڵکەوتووە، قوماریش، وەکوو شەڕابی تەواوی ماڵ و سامانی خۆی لە دەست داوە و ناچار بەگەدایی و سواڵ و هەزاران کاری دور لە ویژدانی ئینسانی بووەو ڕیشەی بنەماڵەی سوک و چروک بووە. (پێنجەم) دەلیلی نەقڵیکە یەقینی تر لە هەمویان فەرمودەی خوایە کە لە ئایەی (٩٠ سورەی مائیدە)دا لەبەحسی شەڕابدا بەیان کراو لێرەدا پێویستی دوبارە کردنەوەی نییە.

## بەشی شانزدەهەم لە مەنهییات (أَنْصَابَ)ە

ئەنصاب، واتە: هەموی ئەوشتانە کە هەڵە بووەکان بە موقەددەسیان دەزانن و تاعەت و عیبادەتیان بو دەکەن. وەکو بوت و مُجَسَّمَە و سەنگ کە

قوربانی و تاعەتیان بۆ دەکەن کە أنصاب هەموو (مەعبودی باتیلە دەگرێتەوە) (پرسیار) با بزانین زیانی ئەنصاب چییەو بو کێیە؟ (وەڵام) زیانی بۆ ئەو کەسەیە عیبادەتی بەتاڵ دەکات و ڕێگای حەقی لێ وەن بووە. زیانی (ئەنصاب): ئەوانەن (یەکەم) ئەوانەی مل بو ئەنصاب نەوی دەکەن و عیبادەتی بۆ دەکەن، ئەگەر بیرو بڕوایان وایە کە ئەنصاب تەئسیراتی چاکە و خەراپەیان هەیە و قازانج و زەرەدیان لە ئیختیارا هەیە و داوای یارمەتیان لێ دەکەن ئەو حاڵەتە شیرکەو ئەو زیان و زەرەدو تاوان و سەزایەی بۆ شیرکێ لەو کتێبەدا بەیان کرا مل کەچی ئەنصابیش دەگرێتەوە کە سەراحەتی ئایەتەکەو بەیانی تەفسیرە گەورەکانیش ئەوە نیشان دەدات. (دوهەم) ئەگەر مەبەست تەوەسسولە و پێیان پیرۆزو موبارەکەو بیرو باوەڕیان وایە کە ڕێزو ئیحترامی ئەنصاب خووا پێ خۆشە و یەزدانی مەزن پاداشی چاکیان دەداتەوە، دیسان کورت و کەمی بیرو عەقڵ و هۆش دەگەیەنێت کە ئینسان بەو هەموو عەقڵ و عیلم و بەرزی و پیرۆزیەوە کە خووا پێیداوە ـ لە شتێکی بێ ڕۆح و بێ حەرەکەو بێ أیرادە چاوەدێری هەیەو پێی وایە خزمەت بە (أنصاب) خزمەت بە خووایە. ئەوەش هەڵەیی گەورەیەو تاوانی زۆرەو سەزای توندی لەڕێدایە. شیاوی بەیانە کە هێندێک بیر تەسک و زاهیر بین، زیارەتگاو مەرقەدی پیرۆزی مەرحومەکانی علیمی و عیرفانی‌ش بەشتێک لە ئەنصاب، دادەنێن و پێیان وایە ئینسان لەهەر پلەو مەقامێکدا بێت کە مردو لە ژیان بڕا، تەئسیراتی (تأسیراتی) نامینێت و خێرات و قوربانی لەسەر ئەو مەرقەدانە هەروەک

خێرات و قوربانی دەورانی جاهیلییەتە لەسەر، سەنگ و بوت و موجەسسەمەکانی (مجسّمەکانی) مەعبودیان کە بە ڕوناکی شیرک دەگرێتەوە و زانیاری غەیبی‌ش لەغەیری خووا سەلب دەکەن کە دەبێتە نەفی عیرفان. وەڵامی ئەوە ڕیسالەیەکی تەواو هەڵدەگرێت بەڵام چونکە ئەو کتێبە زۆر کورتە دەبێ بە کورتی بەیان بکرێت سەرەتا بزانین یەزدانی مەزن لەبارەی عەبدانی پاکی خوی‌دا فەرمویە: **(أَلاَ إِنَّ أَوْلِيَاءَ اللهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ)** (سورەی یونس آیەی / ٦٢) واتە: ئاگادارو هۆشیار بینەوە، کە بە حقیقەت ئەولییای (عەبدانی سالح ڕاستەقینەی) خووایی ترس و خۆفییان لەسەر نییەو مەحزون و غەمباریش نابن. ئەگەر تۆزێک بیر لەو ئایەتە بکەینەوە ئەو موژدەیەی خووا نەبەستراوە، بەدنیا، یان بە قەبری، یان بە قیامەتەوە، بەڵکو هەرسێکیان دەگرێتەوە = دەگەڵ ئەوە زۆر ئاشکرایە کە ترس و غەمێک لەوە زیاتر نییە کە ئینسان پلەو مەقامێکی باشی هەبێت و لێی وەرگرنەوە، واتە ئەولییای خووا ئەو حاڵەتەی لەدنیایە بوویانە لە قەبرو قیامەتیش‌دا هەیانە و زۆر بەجێیە ئینسانی خاوێن بچێتە خزمەتیان، دوبارە هەر لەو سورەتەی (یونس آیەی ٦٥ / یەزدانی مەزن فەرمویەتی): **(اَلَّذِينَ آمَنُوا وَكَانُوا يَتَّقُونَ لَهُمُ الْبُشْرَىٰ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَ فِي الْآخِرَةِ لاَ تَبْدِيلَ لِكَلِمَاتِ اللهِ ذَٰلِكَ هُوَ الْفَوْزُ الْعَظِيمُ)** واتە: ئەوانەی ئەوتۆ خاوەنی ئیمانن و تەقواو عیبادەتی خووا (پەیڕەوی لە قانون و یاسایی خووا) دەکەن لەبۆ ئەوکەسانە هەیە بەشارەت و کەیف‌خۆشی لەژیانی دنیاو قیامەت‌دا و گوڕان لە کەلیماتی

(لە ئەمرو فەرمانی) خوادا نییە. ئا ئەو بەشارەت و پیرۆزیە: (واتا ناوەرۆک و دەقی بەشارەتەکە، کە خۆشترین ژیانی دائیمییە) فەیزو بەرەکەتێکی زۆر گەورەیە. ئەو ئایەتە لە ئایەتی پێشوو ڕوناکتر نیشان دەدات کە عیبادی سالحی خووا (ئەگەر گۆڕانیان بەسەردا نەیەت) ئەو حاڵەتەی لە دنیایەدا هەیانە لە قەبرو قیامەتیشدا لییان وەرنا گرێتەوە. دیسان یەزدانی مەزن (لە سورەی الجاثیة آییەی / ٢١)دا فەرمویەتی: (اَمْ حَسِبَ الَّذینَ اِجْتَرحُوا السَّیِئاتِ اَنْ نَجْعَلَهُمْ کَالَّذینَ آءمَنُوا وَ عَمِلُوا الصَّالِحٰاتِ سَوٰاءً مَحْیٰاهُمْ وَ مَمٰاتُهُمْ سٰاءَ ما یَحْکُمُونَ) واتە: ئایا شەک دەکەن و گۆمانیان هەیە ئەوانەی کردەوەی گوناە و تاوان دەکەن (کافر و خەرابکارن)؟ ئێمە بییانگێڕێن و حیسابیان بکەین، وەکوو ئەو کەسانە کە خاوەنی ئیمانن و عەمەلی سالح دەکەن کە ئەوانە ژیان و مردنیان وەکو یەکە (لەدنیا خاوەنی شەرافەت و پیرۆزین و لە قیامەتی بەهەشتین) ئەوتا وا نکارانە پیسترین قەزاوەتیان کردووە، ئەو ئایەتە لەوانی پێشتریش ڕوناکترە کە عەبدی سالحی خووا حەیات و مەماتیان یەکێکە. هەر لەبەر ئەوەیە عورەفا دەڵێن ئەولیا حەیات و مەماتیان یەکێکە = دیسان حەدیسی موتەواتەر زۆرن لەسەر ئەوە کە زیبارەتی قەبران سونەتە. (ئەگەر فەسادی تیکەڵ نەکرێت) بو نمونە (ریاض الصالحین ص ٢٤٥) بە نەقڵ لە موسلیم: (قٰالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ فَمَنْ اَرٰادَ اَنْ یزوُرَ اَلْقُبُورَ فَلْیَزُرْ فَاِنَّهٰا تُذَکِّرُ بِالآخِرَةِ) واتە: حەزرەتی ڕەسولی ئەکرەم فەرمویەتی: هەرکەسێک دەیهەوێ زیبارەتی قەبران بکات با زیبارەتیان بکات

چونکە لەدیتنی قەبران قیامەتی وەبیر دێتەوەو بیری لێ دەکاتەوە هەروا لەبارەی غەیبزانیدا ڕوداوی تەختی (بلقیسا کە، ئاسەفی بنی برخییار، بە یەک لەحظە لە، سەبا، یەڕا هێنایە بەیتڵمەقدسێ و ڕەفاقەتی حەزرەتی موسی و حەزرەتی خضرﷺ و حەزرەتی زەکەریا و ئەسحابی کەهف بە سەراحەتی (قورئان) غەیبزانینە و هیچکامیشیان غەیری حەزرەتی موسی پێغەمبەر نەبون و بە کەرامەتی ئەولیا دەژمێردرێن، دەگەڵ ئەو ئایەت و حەدیسانەش ئەوانە کە دەچن بۆ زیارەتی ئەو مەرقەدانە ئەشخاسی موسوڵمان و خاوێن و بەهیوای ڕەزائییەتی خووا دەچن و خێرات و ئیحسان بۆ مردووەکان هەدیە دەکەن، نەک داوای خێرات لە مردووەکە دەکەن بەڵکو بە خێرو چاکەی دەزانن (ئەوانەش کە بۆ ئارەقخواردن و ڕەقس و هەڵپەڕین دەچن ئەوانە بە موسوڵمان حیساب ناکرێن و شوێنی بەحس نین). واتە = ئەگەر بە بیرو باوەرێکی خاوێن سەرنج بدرێت نیسبەتی ئەو زیارەتگاو مەرقەدانە بە (أنصاب)ی بێ گیان و حەرەکەو ئیرادە (جمادات) زوڵمێکی زۆر گەورەیە.

## بەشی هەڤدەهەم لە مەنهییات
## ئەزلامە = قورعە یا بەختئازمای یان فاڵ گرتنەوەیە

زیانی ئەزلام ئەگەر بە بیرو عەقڵی سالم سەرنج بدرێت ئەوانەن: (یەکەم) نیهایەتی بێعیزەتی و چروکییە ئینسانێک، داهاتوی خۆی، یان

ڕابردو، یان بەشی خۆی، لە قورعە، یان فاڵ گرەویەکی پوڵپەرست چاوەدێری بکات. (دوهەم) نیشاندەدات کە ئەو ئینسانە ئیمانی زۆر کزە و خووایەک بەو هەموو عەزەمەتەوە کە ئەو دنیا پان و بەرینەی دروست کردوە لەبیریدا نییە و پەنا دەبات، بۆ (چلدانەیەک) یان (دندوکی چۆلەکەیەک) بە پەڕە کاغەزێک ویستی خوێ دیاری بکات. (سێهەم) هەر وەکوو قورماری و سەرخۆش بە فاڵ گرتنەوەو شانس و بەخت، سەرگەرم دەبێ‌و لە کارو کاسبی سست دەبێت تۆشی زەرەرو زیان دەبێت. (چوارەم) ئەو جۆرە کەسانە لەبەر چاوی زانایان سوک و چروک دەنوێنن. (پێنجەم) دەلیلی نەقلییە کە یەقینیتر لە هەموویان فەرمودەی خووایە لە ئایەتی نەوەدی سورەی (المائدە) لە لاپەڕی ٦٤ ئەو کتێبەدا بەیان کراو لێرەدا پێویست نییە دوبارەی بکەمەوە.

# بەشی هەژدەهەم لە مەنهییات

# (سرقة) دزیە

دزی داگیرکردنی حەقی غەیرە بە ناحەق بەشێوی نەهێنی و پەنامەکی، (پرسیار) با سەرەتا لە بەڵگەی نەقلی لادەین و زۆر بەوردی بیری لێ وەکەین کە زیانی دزی چییە و بۆ کێیە. (وەڵام) (یەکەم) کاری نەهێنی و پەنامەکی کە پێچەوانەی قانون و یاسای دینییە پیشەی ئینسانی خوێری و چروکە چونکە ئینسانی عاقڵ کارێک ناکات کە لەلای خووا و خەڵق عەیب و نەنگبێت. (دوهەم) ئەوانە کە دزی دەکەن بێکارە و لاتێکن کە

لەلای خوواو خەڵقی خووا سوک و چروکن و هەمیشە زیندان و مرگ چاوەدێریان دەکات. (سێهەم) دزی بەڵگە و نیشانەی کزی و نەداری بیرو فکری ئینسانیە کە ناتووانی لە ڕێگای حەلاڵ و قانونی کاروکاسبی بکات و ماڵو منداڵی تیرۆ تەسەڵ بکات. (چوارەم) دزی بەڵگەی بیدینی و بێڕوحمییە چونکە ئەو شەخسەی دزی دەکات نەبیر لە قەهر و غەزەبی خووا دەکاتەوەو نە بەزەیشی دێ بە ژن و منداڵی ئەو کەسەدا، کە ماڵیلێ دەدزیت. (پێنجەم) دز ئەو ماڵەی دەیدزیت قەرزدار دەبێت و واجبە لەدنیایە، یان لە پەسلان دەگەڵ سەزای زۆر بیداتەوە. (شەشەم) زۆر روناک و ئاشکرایە ئینسانی عاقڵ و خاوەنی عیززەت شەرافەتی پاک دزی ناکات. (حەوتەم) بەڵگەی نەقڵییە کە لە هەمویان یەقینیتر فەرمودەی خووایە کە لە سورەی (المائدە ئایەی ٣٨) یەزدانی مەزن فەرمویەتی: **(اَلسّارِقُ وَ السّارِقَةُ فَاقْطَعُوا اَیْدِیَهُما جَزاءً بِما کَسَبا نَکالاً مِنَ اللهِ وَ اللهُ عَزیزٌ حَکیمٌ)** واتە، پیاوی دزیکەرو ژنی دزیکەر، دەستیان ببڕن و قەتعی بکەن لە تۆڵەی دزیەکەیان و مل بادانیان لە ئەمری خووا، بزانن خووا زۆر گەورەیە و هەموو کاریش بە حەقو عەداڵەت دەکات (ئەو میزانە دزراوە کە دەستی لەسەر دەبڕدرێت لە ڕوبعە مثقاڵێکە وە بۆ سەرێ دەست پێدەکات و ئەو ڕوبعە مثقاڵەش لە چوار درهەمەوە هەتا دە درهەم تەخمین و بەیان کراوە.

# بەشی نۆزدەهەم لە مەنهییات
## (غصب) غەسبە

غەسب داگیرکردنی حەقی شەرعی‌یە بە ناحەق بە شێوەی ئاشکرا بە هۆی هێزو دەسەڵاتەوە (غصب) ئەندازەی بۆ تەعین نەکراوە و سەزای بە میزانی زۆروکەمی داگیرکراوەکەیە (پرسیار) با بە بیرێکی خاوێن بە وردی سەرنجی بدەین غەسب زیانی چییە و بۆ کێیە. (وەلام) (یەکەم) داگیرکەر سەرەتا ترس و خۆفی لەو هەموو عەزەمەت و قەهری خوواوە لادەنێت قانون و یاسای خووا لەبەر چاو ناگریت دەست دەکات بە داگرتن. (دوهەم) غرورو بەرزی خۆی بەسەر عەبد یان عەبدانی خووادا دەسەپێنێ کە ئەوانیش وەکو ئەو داگیرکەرە عەبدی خووان و حەق و مافی ژیان‌یان هەیە وەکو ئەوی. (سێهەم) ئەگەر داگیرکراوەکە، پلەو مەقامە وەکو ئەوە، کارگەرێکە، یان مودیریکە یان هەر پلەیەکی‌تر، دەرکراوەکە دەگەڵ ئەوە تۆشی زیانی ماڵی و شکستی ژیانی دەبێت خۆی بە سوک و سەرنەوی دەبینێت لەنێو کۆمەڵداو دەبێتە دوژمنی داگیرکەرەکە ئەگەر نەشتوانی تۆڵەی وەربگریت. (چوارەم) ئەگەر نەفسەو بەدەنە (شەخسە) وەکو ئەجیرو، بەردە، ئەوا ئەو داگیرکراوانە دەگەڵ هەمو جۆرە ڕەنج و هەتک و چروکی لە ژیانی شەرافەت و پیرۆزی ئینسانی بێبەش کراون و ئەوانەش وەکو داگیرکەر عەبدی خووان و خووای خاوەن بەزەیی عادڵە و

حەقی هەمو کەس بە توندترین سەزاوە دەگرێتەوە. وە ئەگەر هەتکی حورمەتەو تەجاوەزی جینسی پێکراوە وەکو زیناو، لیوطە، ئەوە بەشێک لە زینایە ئەگەر تووانی سابتی بکات بە زۆری حورمەتی غەسب کراوەو تام و لەزەتی پێ نەگەیشتووە لە سەزای زیناو لیواطە مەعافە ئەگەر سابت نەبو ئەوا بە تاوانی زینا لیواطە حەددە، یان ڕەجمە، سەزا درێت وەکو غاسیبە کە. (پێنجەم) ئەگەر داگیرکراوەکە ماڵ و سامانە، ئەوەی لێی داگیراوە ئەگەر بێدەسەڵات و بێهێزە دیسان ئینسان یان ئینسانهایەک بێتاوان و بە ناحەق دوچاری ڕۆژ ڕەشی کراون و لە ژیان بێبەشکراون کە خووا لە کاتی خۆیدا حەقی ئەوە، یان ئەوانە بە تەواوی وەردەگرێتەوە ئەگەر ئەوەی حەقی داگیرکراوە هێزو تووانایەکی هەیە، دەڕوی داگیرکەرەکە هەڵدەگەڕێتەوەو هەراوکێشە لە نێودا هەڵدەقولێت و ئاگری شەڕێ پەرە دەستینیو خەسارەتی ماڵیو زۆر جاریش بریندارو کوژراو لەنێودا ڕو دەدات. ئەگەر باش بیر بکرێتەوە زۆر ڕوناکو ئاشکرایە، زۆربەی شەڕو خەسارەتی ماڵێ و کوشت و کوشتار و بەندو ئەسیر، لەسەر چاوەی غەسبی (غصبی) هەڵدەقولێت و گەورەترین ئاگری فەساد لە غەسبێ گڕ دەگرێت. (شەشەم) بەڵگەی نەقڵی یەقینیتر لە هەمویان فەرمودەی یەزدانی مەزنە لە سورەی الکهف آیەی / ٧٩ (**وَكَانَ وَرَاءَهُم مَلِكٌ يَأْخُذُ كُلَّ سَفِينَةٍ غَصْبًا**) واتە، بەڕاستی لە شوێن ئەو کۆمەڵەی لەو کەشتیەدا بون پادشایەکی غاسیب بو کە هەر کەشتیەکی سالم بایە غەسبی دەکرد (ئەو ڕوداوە ئاوایە لە منیقەدا پادشایەکی زۆر غاسیب و زاڵم هەبو،

هەر کەشتیەکی سالم بایە غەسبی دەکرد لەبەر ئەوە یەزدانی مەزن فەرمانیدا بە حەزرەتی خضرﷺ کە کەشتیە سالمەکانی خاوەنە پێدەسەڵاتەکان کون بکات بۆ ئەوە کەشتیەکان عەیبدار بین و ئەو زاڵمە غەسبیان نەکات. دەگەڵ ئەو فەرمانە (حضرتی خضر دەگەڵ حضرتی موسی) چونە دە کەشتیەک و حضرتی خضر کەشتیەکەی کون کردو حضرتی موسی ڕەخنەی لێ گرت و جضرتی خضر وەڵامیداوە، ئەو کشتیەم بۆیە کون کرد چونکە بە شوێن ئەو کەشتیەوە بو پادشایەک کەشتی سالمی غەسب دەکرد) (حەوتەم) حەدیسی (حدیث متفق علیە)یە =کە پێغەمبەرﷺ فەرمویەتی: (مَنْ ظَلَمَ قَيْدَ شِبْرٍ مِنَ الْأَرْضِ طَوَّقَهُ مِنْ سَبْعِ أَرْضِينَ) دەگەڵ موسلم و بخاری (لب‌الاصول)یش لە لاپەڕە ١٠٠دا هێناویەتی، واتە، کەسێک غەسب بکات بە ئەندازەی بستێک (شبرێک) لە ئەرزێ، بۆی دەکرێتە تۆقی ئاگرین ئەو حاستە هەر حەوت تەبەقی ئەرزی و دەئەستۆێ دەکرێت، ڕۆژی قیامەتێ، لێرەداڕون بووە غەسب هەروەکو زیانی فەردی تیدایە، زیانی جامیعەشی زۆرە.

## بەشی بیستەم لە مەنهیات

## شاهیدی بە درۆ، ناحەقە

(شَهَادَةُ الزُّورِ) (پرسیار) با بیری لێ بکەینەوە شاهیدی بە ناحەق زیانی چییە و بۆ کێیە؟ (وەڵام) (یەکەم) درۆ، کە پێچەوانەی ڕاستەقینەیە شەرافەت و پیرۆزی ئینسان دەشکێنی و ئینسانی سوک و چروک دەکات

چونکە ئینسانی خاوەن شەرەف و غیرەت درۆ ناکات. (دوهەم) ڕاستی و ئەمینیو وەفا نیعمەتیکن کە بونی ئینسانی بەوانە تەواو دەبێت و هەریەک لەوانە بفەوتێت ئینسان، ناتەواوە، دەگەڵ ئەوە، ئەو ئینسانە بەهۆی شاهیدی بە درۆ، ئەوانەی مراندون و خەیانەتی بە نەفسی خۆی کردووە. (سێهەم) بە شاهیدی بە درۆ، حەقێکی شەرعی و واقعی لە ئینسانێک بڕیوە و خۆی کردۆتە تاوانباری ئەو کەسەو ژن و منداڵی حەق لێبڕاوەکە. (چوارەم) بە هۆی شاهیدی بە ناحەق ماڵێک و حەقێکی حەرامی بۆ داگیرکەرێک سابت کردووە ئەو داگیرکەرەی توشی داگرتنی حەق و ماڤێکی حەرام کردووە. کەویش وەک داگیرکەرەکە لە هەمو بارێکەوە تاوانبارە و سەزا دەدرێت. (پێنجەم) قانون و یاسای خووای وەلا ناوەو بە پێچەوانەی ئەمری خووا رەفتاری کردوەو سەزای توند وەردەگرێتەوە لە تۆڵەی ئەو شاهیدیە بە ناحەقەیە. (شەشەم) دوژمنی و دوبەرەکی، لەنێو بەشخۆرو بەشخوراوەکە، بەڵکو لە نێو تایفەی هەردوکیان، بە هۆی شاهیدی بە ناحەق، دادەنێت و هەزاران تاوان و فەسادی لێ پەیدا دەبێت. (حەوتەم) دەلیلی نەقڵییە کە لە هەمویان یەقینیتر فەرمودەی خووایە و لە سوڕەی البقرە آیەی ٢٨٣ **(وَ لاٰ تَكْتُمُوا الشَّهٰادَةَ وَ مَنْ يَكْتُمها فَإِنَّهُ آءثِمٌ قَلْبُهُ وَ اللهُ بِمٰا تَعْمَلُونَ عَلِيمٌ)** واتە، ئێوە شاهیدی خۆتان ون مەکەن (بەو شێوەیە ئەگەر پرسیان شاهادەتەکە بەیان نەکەن و بێدەنگ بن یان بە درۆو بە ناحەق بەیانی بکەن) چونکە هەرکەس شاهیدی ون بکات بە سکوت و بلێ نازانم یان بە ناحەق بەیانی بکات، ئەوە تاوانبارە دلێ ئەو

شەخسە (شخصە) و خووا ئاگادارە بە کردەوەی هەمو بونەوەرێک پێویستە ئەوەش بزانین نەگوتنی شاهیدی و سکوت دەگەڵ بەیانکردنی بە ناحەق و دوڕ، هەروەکو یەکن چونکە (کەتمان) شاهیدیە ڕاستەقینەو واقعی‌یەکە ون دەکات. خووا بمان پارێزێت لە هەمو تاوانێک.

## بەشی بیستو یەکەم ـ لە مەنهییات

## عقوقە

واتە زایعکردنی حەق دایک و بابەو بێحورمەتی ئازارو ئەزیەتی وانە (پرسیار) با بزانین زیانی زایعکردنی حەقی دایک و باب چیە و بۆ کێیە. (وەڵام) (یەکەم) یەزدانی مەزن دایک و بابی کردونەتە وەسیلەی ئەووەڵیەی ژیانی عەبدانی خۆی، هەتا کاتێک ئەو عەبدە ڕوشت پەیدا دەکات و خۆی پێ دەژیت واتە دوای ئیتاعەی خوواو ڕەسولی خووا، بەجێهێنانی حەقی دایک و باب فەرزە. (دوهەم) دایک نۆ مانگ یان زیاتر ئەو ئینسانە، کۆرپەی دەنێو زگی خۆیدا هەڵگرتوو هەزاران ئازارو رنجی بۆ کێشاوە تایبەت لەکاتی بویندا ئەو ئینسانە لەکاتی توانایی خۆیدا بەودایکە قەرزدارە و دەبێ تۆڵەی چاکەی، بە چاکە بۆ بکاتەوە. (سێهەم) دووابی بونی ئەو ماوەی دو ساڵ یان زیاتر دایکی بەشیری مەمکی خۆی بژیوی دەداتیو باوکیشی وەسیلە ژیانی ئەو ئینسانەو دایکیشی تەأمین دەکات و هەموو پێویستیەکیان بۆ دابین دەکات، دیسان ئەو ئینسانە بەو دایک و. بابانە قەرزدارە و دەبێ تۆڵەی چاکەیان بە چاکە

بداتەوە. (چوارەم) ئەو دایک و بابە ماوەی پازدە ساڵ یان زیاتریش تەواوی پێویستی ژیان و فێرکردن و بارهێنانی و ڕاهێنانی ئەو ئینسانە دابین دە کەن و لەو ماوەشدا دوچاری هەزاران کوسب و تە گەرو تەنگ و چەڵەمە دەبن لە ڕێگا پارێزگاری لەو ئینسانەدا دیسان ئەوەش قەرزداریە کی زۆر زیاتر لەوانی پێشویە، دەبێ چا کەیان بە چا کتر بداتەوە. (پێنجەم) تۆڵەی چا کە بە خەراپە بدرێتەوە نیشانەی سپڵەیی و حەقناسیەو بەڵگەی چروکی‌یەو ئەو ئینسانە لە شەڕافەت و کەڕامەت و پیرۆزی ئینسانی بێبەشە. (شەشەم) دەلیلی نەقڵییە کە لە هەمویان یەقینی فەرمودەی خووایە لە سورەی (الاسراء = آیەی / ٢٣)دا فەرمویەتی: (وَ قَضىٰ رَبُّكَ اَلاّٰ تَعْبُدُوا اِلاّٰ اِيّٰاهُ (١) وَ بِالْوالِدَيْنِ اِحْسٰاناً (٢) اِمّٰا يَبْلُغَنَّ عِنْدَكَ اَلْكِبَرَ اَحَدُهُمٰا اَوْ كِلاٰهُمٰا فَلاٰ تَقُلْ لَهُمٰا اُفٍّ وَ لاٰ تَنْهَرْهُمٰا وَ قُلْ لَهُمٰا قَوْلاً كَرِيماً (٤) واتە، حوکمی کردووە فەڕزی کردووە، خووای تۆ (ئەی پێغەمبەرﷺ) کە بەندە گی و عەبدایەتی نە کەن ئیڵلا بو خووای (خالیق و مالیک و ڕازیق)ی خۆتان نەبێ کە اللّٰهیە (١) وە هەروا فەڕزی کردووە لەسەر ئێوە کە دە گەڵ دایک و بابی خۆتان چا کە و یارمەتی بکەن و ڕێزو ئیحترامیان نیشان بدەن (٢) وە ئە گەر لەلای ئێوە پیربون یە کێکیان یان هەردوکیان، خزمەت و یارمەتی چا کیان دە گەڵ بکەن و ئە گەر لەو ڕێکەیەدا و بە هۆی خزمەت و یارمەتی وان توشی نارەحتی و ئازار بون مەڵێن وەی یان آخ و داخ بەو وشانە دڵیان مەڕەنجێنن و دەریان مە کەن (٤) بەڵکو لە ڕۆی وان لەبارەی واندا بەیانی چا ک و شیرین بکەن و دڵیان شاد

و بگەشێتەوە (ئەو ئایەتە، تەفسیری (قرطبی) مجلدی دە لاپەرە ٦١ تا ١٠٠ لە شانزدە بەشدا بەیان کراوە کە بە داخەوە لێرەدا جێی نابیتەوە) براو خۆشکانی موسوڵمان و خاوەنی هەست و بیری ئینسانی هەتا ئێرە لەو پەرتوکەدا، ئەمرە کانی (خالیق و مالیک و ڕازیق) یەزدانی مەزن، لە شەشە بەشدا واتە أیمان و پێنج ڕوکنەی ئیسلام و نەهیە کانیشی ئەوانە کە بە هاودەنگی تەواوی زانایانی دینی یان زۆربەیان کە بە ئەکبەری کەبائیر (اکبر کبائیر) ناسراوەن لە بیست و یەک بەشدا بەیانم کردون و لەهەر بەشێکدا دەنکێك لە خڵوارێک (فەلسەفەی) قازانج و زیانی ئەو بەشەم بەیان کردووە. بە هێوای ئەوە کە لەوەنکەڕا، بەرەو خڵوزاری حیکمەت و فەلسەفەی دین بکەونە ڕیگەو بە ڕاستەقینەی دینی پیرۆزبن ئەوەشمان لەبیر نەچێت کە (عبدالله‌بن عباس) فەرمویەتی کە بایر لە حەفتاو، سعیدبن جُبَیْر فەرمویەتی لە سەدو حەفتا نێزیک دەبنەوە، ئەمن لە نێو هەمویاندا بیست و یەک یانم هەڵبژاردون کە بە ئەکبەری کەبائیر، تەعین کراون و ئەگەر خووا یارمەتیم بەفەرموێت ئەوانی تریش بەیان دەکەم، دواین بەش: بە ئاوات گەیشتنی گشت لایەنەی هەمولایەکتان لە یەزدانی خاوەن بەزەیی تکایە.

**و صلی الله علی سیّدنا محمد و آله اجمعین الی یوم الّدین**

**و آخر دعونا أن الحمد للهِ ربّ العالمین**

ڕەسول عطوفی

١٣٧٦/١١/١٤ شمسی

یـەزدان تـو مـنت وەدی هـێناوە

هەرچێکی هـەمە تـو بـە منت داوە

دەتتوانـی بـمکەی بە زانـای تـەواو

وەک خضری زیندە لە وشکی لە ئاو

منیش پێم خـۆشبو عـیلمی (لَدُنّی)

خەڵاتی منبا ـ بە هەمو فەننی (فَنّی)

چبکەم نـەتبەخشی بـە مـنی بێهێز

خۆم ناکرێ بە خۆم بدەم پلەو رێـز

ئەوەی کە هەمە، هەر ئەوەت پێدام

کەڕامگەیاندووە، پێکام نـە پـێکام

کاتێ نـافرۆشی تـۆ ڕەحـمەتی خـۆ

گەدای ڕوحـتم، مـەمکە ڕەنـجە ڕۆ

ئـاواتـم خـزمەت بـە یـاسایی تـۆیە

تکـــام بـــەراتـــی، بـــەزەیی تـــۆیە

## دڵم مەجنونی بێ لەیلە

دڵم مەجنوونی بێ لەیلە یـەقـین وێنـەی لـە دڵـدایە
لـە نیـۆ خێـڵی بـەڕێزانـدا بـەرزتـر ئـەو لـە پاشـایە
خەیاڵی بۆتە مانی هـەر دەمـە نـەقـشێ دەکاتـە سـویر
دەڵێ وێنەی لە بەرزیدا وەکـوو هـەر نـەبـووە هـەرنایـە
لە بۆنی عەترو میسکە بۆتە مـەعـشووقەی ئـەویندـاران
لە ناسکی پەلکی گوڵ سەوزە لە لای هەر عاقڵ و زانایـە
درختی عەر عەر و سەرو و لە سەجـدەی قـامتی ئـەودا
زیبـایی بـاغ و گـوڵزارە خـەلاتی کـاخ و ویلایـە
لە ئاوی ڕەحمەتی حەقـدا شـۆراوە پـاک و بـێ عـەیبـە
لـە بۆیـە چاوی پڕ عـەیـبم بـە دیـداری شـیاو نایـە
بە ئـەسـرینی ڕژاو دائـیم بـە سـەر کـورەی ئـەوینمـدا
نـەوی نابـێ بڵێـسەی دڵ ئـەوا بـۆ سـۆی هـوەیدایـە
(تۆراو)ی وا لە دەرگای ڕەحمەتیدا سەر لـە سـەر خاکـە
تەمەننای ڕوحـم و دیـدارە لـە پـەسـلان و لـە دونیایـە

***

## دوژمنی زاڵم

(تۆراو) له زوڵـم دوژمـنی زاڵـم بهڵكوو دهست كهویٚ ژیانی سـالم

خهرمانی دونیام بـهكـهو دابێـژا زوربهی كهلووبوو كهمی بوو سـالم

ئهوهی بهكه لکه یاسای یهزدانه لادهم ده سوتیٚ گشت پـهڕو باڵـم

لهرۆژی حیساب ڕهزگاری سهخته كورتـه كـردهوهم هـاوار بـهماڵـم

چبكهم له فیتنهی خێڵیٚ (الخنّاس) به چهوری بهیان تێكنـهدا حاڵـم

وهدی هێنهری گشت بوونـهوهران پـهرژینم نـهكـهی وێرانـه ماڵـم

«توراویٚ» غهرقی گێژاوی ژینـه ههردهم به دهردیٚ گـیرو دهناڵـم

***

## یا رهسوولوڵلا

یـا «رسـول اللّـه» زهلیـل و بـیٚكـهس و بـیٚ قـودرهتم

بـۆ ئیتاعـهی پـاكی تـۆ نیمـه سـهعاتـیٚ دهرفـهتم

غـهرقـی گێـژاوی ژیـانم پـڕ خـهتـهر پـڕ دهردو غـهم

بـیٚ غـهواس و زهوڕهقـم وهک بـیٚ بنیـای و بیٚخـهتم

عیشقی دونیا بوو به ژارو كهوته شیـشه ی قـهلـبی مـن

مهست و بیٚ هۆشی عهزاب و ئێشی جـهرگـی لـهتلـهتم

كـیٚ لـه پانـایی زهویـدا شـكبهرم فریـام كـهویٚ

بـیٚ بـه هـاوارم، بكـا دهرمـانی زام و عیللـهتم

گەر نەدا پـیم خـالیقی ئـەو کـورەی کـەون و مـەکـان
عیلمــی لوقمــان و ئــەرەســتو نــادا هێــز و قــودرەتم
یـا ڕەسوڵـە اللە تکایـێ ئـەرحـەمـی گـشت ڕاحـیمین
ڕەحمەتێ پرژێ بە سەرما یەک لـە جـەمعـی ئوممـەتم
غەیری دەرگای بەخششی ئەو نیمە هیچ کونج و پەسـیو
زوو بـەکـا دەرمـانی (تـۆراو) پـڕ لـە نـوور بـێ نییـەتم
***

## ڕووت نیشاندا

ڕووت لــە مــانگی نیــوەی مانگــدا نیــشانتدا بــە مــن
مەر شوعاعی مانگ لە تـۆوە وەگـیرا جـەمعـی زەمـەن
شانوشــینی تــۆ بــە تــامی کــام بــورج ســەبــتی ئــەزەل
چۆن زەمین بۆتە سەما لەو وەزعـە شـێوا عـەقـڵی مـن
حوسنی یوسف دانە یـەک لـەو خـەرمـەنی زیبـایی تـۆ
چۆن دەکا شەرحی جەلالی بۆن و خوڵقت فکـری مـن
خالیقی تۆ جەمعی بوونی خـستە ئـەسـتوێ بـوونی تـۆ
واتـە بـەرزی هــەر لــە تــۆوە بــۆ خــەلاتی ئــەنجـومن
شـــاڕێگا بـــۆ تائیبـــان هـــەر ڕەوزەی پـــاکی تۆیـــە
وا لە دەرگای قاپی تۆ دان، بیر و هۆش و عـەقـڵی مـن

پێم کەرەمکە رەحمەتیێ (نجم و قلم) وا سیفی تۆن
تا نەجاتی بێ لە باری شوومی تاوان گیانی من
باری ویسالت کەرەمکە پاکە روحی عاشقیم
بێ بەشی یار و موعینە پڕ غەمە (نۆراو)ی من
***

## دوو دەگەڵ نەوەد کەوتە ژیانم

دوو دەگەڵ نەوەد کەوتە ژیانم تیر بژی تەمەن هاتە نەمانم
گوڵی ئاواتم تەنها خەیا لە نەبوو سەوز بێ لە بەرچاوانم
رۆژ لە ئازاری هەزاران دەردم لەرزەی لاشەمە هەموو شەوانم
هەرچی بە فکرم بەهرەی تەواوە دووایی دەبینم پڕ لە زیانم
لە هەر کۆمەڵێ هیوام بوو یاری نیشانەی تیری بۆ نیو چاوانم
هەرچی بە زەحمەت دامچاند لە زەوی لافاوێ بردی خەلە و خەرمانم
ئەوەی بەراستی خۆم کردە فیدای ئەوبردی هەموو ماڵ و سانم
نەمدی ئەوینێ بە راستەقینە لە دۆست لەرەفیق لە نیو خەرمانم
تەمەنی (نۆراو)زیندانی غەم بوو ئیلاهی شوکر خاوەن ئیمانم
***

## ژینی پر دەرد و عەزاب

پول و ملک جەمعی حەیوانی کەوی
هێندە زور بێ پڕ بکا سەفحەی زەوی

با پلەی خاقان و میری ئەشهەری نیـۆ جامعـە
سەرورانی دەوری ژینی گشت لە پێش سەر نەوی
ژینی پردەرد و عەزاب و ئەرکێ بۆ ئەولاد و ژن
گەر بە هێز و قودرەتی شێرابە بـێ دەکـرێ نـەوی
مەر سولەیمان ماوەی ژینی نەبو دەرد و غەمی
مالکی مـلکێ زەوی وەک بونـەوەر کێـوی کـەوی
دەردی عیشقی بلقیسا بوو مالکی تەخت ولەی
دەستی گرد دامانی ئاسف بۆی بکـا مالـی کـەوی
چاکترین سەروەت ببێتە دوکتـری زام و بـرین
ڕێگەی خۆشبەختی و مەردانـەگـی بگـرێ بـەوی
گەر نەبەخشێ بەهرەیێ بو دین و دونیـا ملـک و مـال
کۆلــە پۆلــووی ئــاگرە ڕۆژێ دەســوتێنی ئــەوی
دەردی خۆرکەی نیو دەروونە قووتی نـانی و میـشک ورەق
گەنج و ملکێ کۆدەکابە هرەی چەوەر دەگـرێ لـەوی
مامە (تۆراو)ی پەرێشان غەرقـی گێـژاوی بـەلا
لەو هەموو ئازار و ڕەنجەی کەس نەبـوو پرسـێ لـەوی
***

## ژینی هێلانەم

لە پێنجەم تەبەقدا منـا هێلانـە
بە یاسای ئەو ڕۆ شۆینی میرانـە
بەرابەرم کرد دەگەڵ ئەو کۆخـەی
بە قـوڕ و بـەردێدا منـا ژیرانـە
لە گۆشەی باغی نێو دار و سەوزی
سروێسی شیپاوی ماڵ و خێرانە

ژینی هێلانـەم دوژمـنی خـەوە پەشـێوێ گیـان و تاڵـی ژیانـە
دەنگی ماشێن و تەقەی وەستاکـار هەر یەک بە نەوعێ ڕۆژ و شەوانـە
ئەویش زیانە بـۆ مێـشک و دەرون شـێوانی ڕوح و بـیری فـەرزانـە
خۆراکم کۆنە بە مانگ و بەساڵ لە پاک و پیسیش دڵ نیگەرانـە
ئاخ بۆ ئەو کۆخەی ئارام بوو خەوم هەناسەم بـۆنی گـوڵ و ڕیحانـە
سەوزی نیۆ باغ و نان ساجی فـەوری گۆشتی جوجەڵە قووتی ڕۆژانـە
شیرو ماست، ڕۆن لە حەیوانی خۆ کە ڕەوهەنگـوێنی مێـشی خۆمانـە
بەری باغ تێکەڵ لە هەمونەوعێ لەسەر سفرەیە لە پێش خێزانـە
دەگەڵ (کەوسەری) چالاوی باغی دەیدا بە (تۆراو) هێـزی شـێرانە
ئێستا لە داخی ژینی لە دست چـووم وەک تووتی برسی گیانم لە رزانـە
نووکی پێنووسم هەرچی دەسورێ پەشێوێ گیـان و لالـی زوبانـە
هیچ لە خێل سوفیان ئەژیان لە نێو کـاخ بەڵکو لە نێو کۆخ بوونە فەرزانـە
بەلام دەستی زۆر لە سەر ئـەو خاکـە گەلێکی کردون شێت و دێوانـە
بۆ بەرزی پلە دەڕوون بێ وچـان دەکەونە چاڵێ قەهری یەزدانـە

***

## بەهاری نەوەدو دوو

سەرنجمدا بەهاری (نەوەدو دوو) نەبـوو شـێوەی بـەهارانـە

هەمیشە پڕتەم و هەورە بـەلام خاڵـی لـە یارانـە

لە لایی سەوزی مل خوارە دەڵێ تێنومـە بـێ ئـاوم

بە وێنەی داد و هاواری بێ ئاوی خاک و دارانـە

وەکوو سۆفی کەشاوەرزم هەمیشە دەست بە دۆعایە
دەڵێدا چناوی نیۆ خاکم بە تەنها ئاوی دەرمانە
ئەگەر خاڵە بەهارم هەر نەبارێنێ بە سەر ئەرزێ
لە مەحسولاتی ئەو ساڵەم تەواو پڕ نابێ هەمبانە
تەماشای کۆرپەی گوڵ کە دەگەڵ سەوزی کز و ماتە
لە بۆ کێشانی باڵای خۆ کز و بێ هێز و حەیرانە
شنەی سروەی سەحەر نابێتە ئاوی هێز دەری ئەرزێ
بەزەردی گوڵ خون و سەوزی سەما نابەخشی یارانە
خەیاڵی مامە (تۆراو)ە لە دار و بەرد و ئاوو گڵ
دەپرسێ مووبەموو ڕیشە کەشف بێ شێوە فەرزانە

***

## دەردی غەم

دەردی غــەم دەرمــانی یــار و پێکــەنــین و شــادیە
دیمەنی گــوڵزار و بــاغ چــۆم و چاوگــەو کانیــە
گەر لە بۆ سەیر و سەیاحەت یاری دڵ کەش بێتــە وێ
بۆ هــەمــوو دەرد و برینــێ دیمــەنی وی شــافیە
غەم ئەگەر سۆزی ئەوینە تــوروە بــۆ قــەلــبی وەلی
ڕوون دەکا ڕێگەی (ضلالت) یا ڕێگــەی یــەزدانییــە
سۆزشی نوری ئەوینــە نــەفــسی ئــەممــارەی بــڕی
بوو بەکانی زیکر و تاعەت کردەوەی ڕەحمانییــە
گەر نەسووتی نەفسی پیس و دژ بە حوببی جاه و مــاڵ
ئاوێنەی قەلبی سیاه و پــڕ غــەمــی ژیــن فانییــە
عیشقی پووڵ و ملک سەروەت جورمــە نێــوی عاشــقی
ئەو تەماع کاری ژیانــە و کــردەوەی نــەفــسانییە
ڕوحی پاکی ئەولیــا بــەهــرەی ئــەوێنیکــی حــەقــە
بۆیە (تۆراو)یش لە ڕێگــەیــدا بــە جــان قوربانیــە

***

## *(چاکە چوکە لەوزمی بیتاب)*

| | |
|---|---|
| چاکە چوکەڵــەی پــیرۆز بــەنــاو | لە تۆوهاوسێیان دروود و سەڵاو |
| ئەتۆمەنبەعی ژیانی مــن بــووی | هێز دەری دڵ و ڕەوانی من بــووی |

میراتی باب و باپیرانی تۆ — ئاوێنەی بوونی ڕابردوانی تۆ
بوونی تۆ دەگەڵ بوونی زەمانە — دووری لە کزی و شێوەی پیرانە
ئەتۆ باشتری لە زێڕ و گەوهەر — چوون ئەوان فانی دەڕۆن بە هەدەر
شیاوی ڕێزی بۆ هەموو زانا — بەرو بەرهەمت قووتی ژیانە
نێوی تۆ لە سەر دڵم نووسراوە — ناچێ لە بیرم تا ژیانم ماوە
بەڵام وە رەسمەم کەم بیر و هوشن — بۆ موددی ڕۆژێ باش تیدە کۆشن
قاتی و نەبوونی و سەختی زەمانە — لە بیریان نایە چەندە پڕ، ژانە
بێ هەوڵ و کۆشش بۆ ڕۆژی دوایی — بە رووت و برسی ئەکرێن خۆدایی
چاویان لە زەرق بەرقی زەمانە — هەر ئەو ڕۆتیرێن بنون شەوانە
لەگڵ و گەوهەر نەیان بوو تەمیز — بۆ تولی زەمان کامەیان عەزیز
گەنم و گەوهەریان لابێ تەمیزە — بۆ کاتی برسی کامیان عەزیزە
چوون نەیانتوانی پاریزگاری تۆ — هەڕاجیان کردی هەرزان و فیڕۆ
کەوتیە ژێر دەستی شەخسی بیگانە — دائیم لە بۆ تۆ دڵم پڕ، ژانە
ماوەی ژیانم هاو ڕازی من بووی — جەوری زەمانە ئێستاکە، وون بووی
مەقبەرەی (مام عباس) لە ژێر باڵی تۆ — نشێگەی بەرزی باڵدار و پێ ڕۆ

***

دووازدە (وەرەسەم) لەوێ تێژراوە — ئەسەری بون ژین یان بڕاوە
ئیستا پەرۆشی ئەو ژینەی خۆمە — لە بێ حورمەتی و ئازار و لۆمە
چوونکە بە زۆری دەبینم زوڵم — لە هەمو ژیان (تۆراو)ە دڵم

***

## پیری

پـــیری و بــێ هێـــزی دهگـــهڵ ئـــارهزو
دائـیم شـهڕیانـه لـه سـهر ویـستی خـۆ
پـــیری لــــه دونیـــا تـــهواو بێـــزاره
لـه نێـو جامیعـه پـیر عـهیـب و عـاره
لـــه کـــار و وتـــار تـــهواو بـــێ هێـــزه
لای تیپـی جـهوان سـووک و بـێ ڕێـزه
ســـــووک و چرووکـــــی ژن و منداڵـــــه
فـهرمـان و وتـهی هـهمـووی بـهتاڵـه
مـــاڵ و ســـامانی بـــهرهنجـــی شـــانی
پێکـــــی هێنـــــاوه لــــه بـــۆ ژیـــانی
ئیـــــستا وهرهســــــه لــــــهوی بـــــڕیوه
بـێ مـاڵ و فـهقـیر وهکـوو هـهتیـو
منـــداڵ پێـــی نـــادهن خـــۆراکی شـــیاو
لیباســـــی کۆنـــــه گـــــهلێکـــــی دڕاو
کـــهوتوهتـــه ژیـــنی تـــهواو هـــهژاری
زۆریـــش دهناڵـــی لــه بــهر ئـــازاری
دهگـــه ئـــهو حاڵـــه مـــیری ئـــارهزۆ
تـــهواو بـــێ غـــهمـــه لـــه بـــهدهنی خـــۆ
دهڵـێ مـن ئاغـام لـه سـهر ئـهو ماڵـه

باشترین ژینی بۆ من حەلالە
بەسەدان سالە ڕەنجم کێشاوە
هەتا ئەو مالەم وە سەر یەک ناوە
دەبێ ئاواتم باش بە جێ بێنن
هەرگیز دلی من تێک نەشێوێنن
بە فەرمانی من بڕوا کار و بار
نەکرێ لە و مالە کاری عەیب و عار
خۆراکم بە پێ ئاواتی خۆ بێ
جل و جێی خەوم وەک میری خۆ بێ
زۆر بە دل گەرمی ئەهلی ئەو مالە
هەزاران تەعنەی دەکەن حەوالە
تۆ، بویە بەلا و ئازاری ئیمە
دلن لە داخت پڕ، زاوم و کێمە
چلکن و لە ڕۆژک بۆ گەنیوی تۆ
ئیمەی نەخۆش کرد بۆ لە و پرتەی تۆ
دانیشە بێ دەنگ ئەوەی پێیاندای
سوپاسێ بکە لەوەی بۆی هێنای
وامە کەشەوێک بتخەینە چالێ
هیچ کەس نەزانی لە تۆ هەوالی
پیری و ئارەزوو حالی بوون تەواو

دەرگـــای ئاواتیـــان تـــەواو بـــستراو
وەلامیـــان تکـــەی ئـــاوی ئـــە ســـرینە
ڕوو لـــە ئاسمـــان و ســـەر لـــە زمینـــە
پـــیری و جـــەوانی تاریـــک و نـــوورن
لـــە بـــەرنامـــەی ژیـــن لـــە یـــەکتـــر دوورن
ئـــەوە نـــەزەری خاڵـــەی (تـــۆراو)ە
لە ســەر ئــەو خاکــە گــەلێــک ڕووی داوە
***

## تەماع هێندە بە هێزە

لە دونیا گەر تەماشا کەی پــەڕی ژیــن
لە هەر لا تێکـشاوە بــەســت و پــەژیــن
تەماع هێنــدە بــە هێــز و پــڕ ئــەوینــە
بــە زوربــەی دڵ بــەســەرداری تــەعینــە
هەموو قــەوم و نژادێــک ســەر شــیواوە
بــە دڵ دونیــای دەوێ چــۆنی تــەواوە
لە ئاخیر مــەغــربی ئــەو ســەر زەمینــە
گەڵی تەسخیری لای شەرقــی ئــەوینــە
تەماع خۆرکەی دڵ و مــەغــز و ڕەوانــە
لە هەر شەخسێ چەسب بوو پاســەوانــە

لە ژین چاوی دەیبینێ گەنج و سامان
دەچێ ترسی لە مردن قەهری یەزدان
ئەگەر بەهرەی تەلاشی بێ وچانی
بە چەند میلیارد گەیی هێز و تەوانی
لە کاترلیون دەهاڵێ زوو ئەوینی
دەکا قوربانی بوونی نەقدی ژینی
بەکینتلیون و ڕیگای دەیڕی چاوی
بە دووی دایە ئەگەر ببەستی هەناوی
لە ژێر دەستی گەدایی وا لە نێو خۆڵ
وەکوو حەیوانە بێ قاچێ لە جێ مۆڵ
بە کەمتر کۆمەکێ ناکا ڕەچاوی
کە بۆێ بکرێ جەمێکی نان و ئاوی
کە پێی وایە فەقیر مەحرووم لە ژینە
بەشی کۆلان و کووچە و سەر زەمینە
نییە ئینسان دڵ و گیانی وەکوو خۆی
وجودێکە خەلق کراوە بە فیرۆی
لە قانونی خودا دورە خەیاڵی
چە تۆقی ئاگرە ژینی کەماڵی
(تۆراو) هەرچی گەرا زۆر چوست و چالاک
عەدالەت زۆر و کەم نەی دی لە سەر خاک

## عیشقی ناکام

بــەداغــی عیــشقی ناکــامم دەناڵــم
بە دوویـدا ڕۆژ و شــەووێنــەی ســەیاڵــم
لە هــەر باغــێ کــە پـێم وایــە لـەوێـدا
دەبیـــنم شاگوڵـــی دێرینـــە ساڵـــم
بەوردی هــەڵــدە کـۆژم دیمــەنی بـاغ
دەبیـــنم بــۆ ویـــسالی کورتــە ساڵــم
ئەگەر ژینم لــە حــەفتـا تـێ پـەڕیـوە
ئەدی کەنگــێ دەبــێ عــومری کــەماڵــم
شــیاوی وەســلی یــار و دیمــەنی بــێ
نەجاتم بــێ لــە ئــەو ڕەنجــەی بــەتاڵــم
دەوایــی زامــی عیــشقم بــێ ویــسالی
کەمێک ئارام وەبــن قــەلــب و خــەیاڵــم
دەمێکــە موبتــەلای ســۆزی دەروونم
لــە دووری ئــەو گوڵــەم وێرانــە ماڵــم
پــەنــا ئــەی باغــەوانی شاگوڵــی دڵ
بەکە ڕوحمێ بە عــەقــڵی کــرچ و کاڵــم
خەلاتم کە لــە عــەتــری هــەڵــشکاوی
کە (تــۆراو)ی هــەمــوو ڕێگــای بــەتاڵــم

## تەڵقینی (تۆراو)

لــە ژێــر چــەتــری حاسمــان  بــە مــاوەی بــوونی زەمــان
کــێ دیویــەتی لـــە دونیـــا  یـــا بیـــستبێ لـــە ئـــەنبیـــا
کــەســێ مــردن نــەچێــژێ  غــەرق نــەبــێ لــە گێــژی
ســـوفی و دەروێـــش و مـــەلا  شـــێخ و وەلی و ئـــەنبیـــا
پیـــان نـــەدراوە ئـــەمـــان  بـــۆ هــەر بوونێکــە نــەمــان
ئــەگــەر هۆشــت لــە خۆیــە  یــەقــین مــردن بــۆ تۆیــە
ئــەو ژینــە بــە جــێ دیــلی  ئــەدی لــە دوای چــی ویــلی
بــۆ لــەحــەولی ژن هێنـــان  گەنج و کـەنـزت بـە خـەرمـان
منـــداڵ زۆر بێنــە ســەرجیت  تێکــەڵ لــە عــاقل و شــێت
هێنـــدێک زانـــای تـــەواون  هێنـــدێک بـــە دزخولـــقاون
هێنـدیکیان مـەسـت و لاتـن  بـــەلای ژیـــن و حـــەیـــاتن
هـەمووشـیان دەغـەمـی خـۆ  تـــالان دەکـــەن ماڵـــی تـــۆ
تـەنگـەش تونـد دەکـەی لـە خـۆ  حـەرام دەکـەی خـە و لـە خـۆ

زۆربکـــەی ســـەروەت و مـــاڵ تێکـــەڵ حـــەرام و حـــەڵاڵ
وەکـــۆیی دەکـــە ی بـــە کلـــور بژێـــرەی دەرچـــێ لـــە ســـنور
لـــە پـــڕ دەڕوێ لـــە جێـــی خـــۆ دەمـــرێ نـــازانی بـــە خـــۆ -
کفـــن و گـــڵ بـــەشـــی تۆیـــە ئـــەویـــش پـــڕ کـــوڵ و کۆیـــە -
ماڵـــت هـــی کـــە لـــە پـــوورە بـــەر هـــەمـــت ئـــاوری ســـوورە
هـــەرچـــی کردووتـــە وەکـــۆ توقـــە بـــۆ گـــردنی تـــۆ
واتـــە ئیـــستا کـــە مـــاوی خـــاوەن عـــەقـــڵی تـــەواوی
لـــە بـــۆ تۆڵـــەی جـــورمی خـــۆ پـــەخـــش بکـــە ماڵـــی خـــۆ
توبـــە لـــە هـــەر تاوانـــێ دەگـــەڵ پـــاکی ئیمانـــێ
بـــەرەبـــۆ قـــاپی یـــەزدان نـــە حاتـــت بـــێ لـــە ســـووتان
دوای تۆبـــــە فیرۆیـــــە جـــەهـــەنـــەم جێگـــای تۆیـــە
ئێـــستا مووڵـــەتـــە بـــۆ تـــۆ پاکـــەوکـــە ژیـــانی خـــۆ
بۆیـــە (تـــۆراوی) ژیـــان تکـــای عـــەفـــوە لـــە یـــەزدان

## فیدای ئەوین

یەقـین ئیـسلاحی کـاخی یـار کـراوە
بە ئـەعلاتـر لـە هـەر قـەسـریّ گـۆڕاوە
لە ڕێگای سەخت و دووری سـەرشـێواوم
لــە ڕۆینـــدا چـــرای هۆشـــم کـــوژاوە
لە بۆ دیـداری ئـەو قـوتبی عـەریفـان
شـــەوو ڕۆژیّ قـــەرارم لـــیّ بـــڕاوە
کلیلـــەی قفـــڵی ڕێگـــای ئیتتـــسالی
ئـەگـەر بـەیعـی بـە جـانم بـیّ کـراوە
زیبایی خەلق و خـولقی هـەرزە مانـیّ
لـە لای یـەزدان خـەلاتـە و پێـی دراوە
ئــەگــەر دیوانــەی ســۆزی ئــەویــنم
بـــە هێـــز و قـــودرەتی هۆشـــم بـــراوە
بــە شـــانازی دەزانی خاڵـــە (تـــۆراو)
کە بـۆ فیـدای ئـەویـنی خـۆی شـیاوە

## خەیالی بێ هوودە

خەیالی بەرز و بێهوودە لە مەغزم دا لە گەڕ دایە
ئەوینی وەسلی یارێکە کەمە، وێنەی لە دونیایە
لە ئاواتی ڕیا کاری ئەگەر چی دوور و بێ مەیلم
عەقڵ کێشەی دەگەڵ نەفسە لە مەیدانە لە شەڕ دایە
دەڵێ یارم لەگوڵزارە بەڵێنی وەسلی پێداوم
کە چی وەک (مامزی) چابوک بە ئازادی لە سەحرایە
نەجێی تەعنە کە لە شوێنی ئەوینە ڕۆژ و شەو دائیم
وەکوو (مەجنون و مەم) عاشق نەبوو چاتر لە دونیایە
لە هەر مەغزێ ئەوینی پاک ڕیشەی داناو قەدی کێشا
لە خۆ پوژینی و سەرمایەی دەتۆرێ وێڵی سە حرایە
لە جێگا شادی و ژینی خەزینە و گەنجی قارونی
ئەوینی دادەنێ عاقڵ کە شارێگای بە مەولایە
«توراو»ێ پیر و بێ هێزە لە دەشت و کێو برا، ژینی
لە کوخی خەڵوەتی بەندە تەمەننای روحمی (اللّە)یە

# دیداری یار

## *وەرگیراو لە (مثنوی)*

بـەتـینی سـۆزی عیـشقی دڵ سـووتاوم
لــە بــۆ دەرمــانی دەردی زۆر گــەڕاوم
یـەقـین دیـداری یـاری خـۆی دەوایـە
وەکوو (تـووتی) لـە بـەنـدی غـەم ڕەهایـە
ئـەویـش ڕێگـای ویـسالی بـەسـت راوە
وەکـوو تـاجر لـە (تـووتی) خـۆی بـڕاوە
لە نیۆ شـاریَ یـەکـیَ بـوو تـاجری چـاک
لە پیشەی خۆی گەلێک خـاوێن و دڵـپاک
لـە پیـشەی خێـر و چاکـەی شـارەزابـوو
لـە پێـشی تـوتی یـەک جـوان دانـەرابـوو
بە شـێوەی زۆر جـوان پـڕ خـەت و خـاڵ
بـە چیـرۆک بـەیـان شـادی دەری مـاڵ
هەمیـشە هـاو دەم و یـاری ئـەمـین بـوو
وسـیلەی بیـنین و شـادی ژیـن بـوو
ئـەمـیر خواجـە لـە بـۆ کـاری تیجـارەت
لە هێندوستان تەواو هەی بـوو مـەهـارەت

گوتی تووتی چە بێ هەدیە لە بۆ تۆ
لە بۆت بێنم کە ڕازی بێ دڵی تۆ
گوتی هەدیەم وەلامێکە (قنوتی)
پەیامی من بەرە، بۆ قەومی تووتی
بڵێ من خاوەنی تووتی جەوانم
دەڵێ من بە ندو زیندانی زەمانم
لە ئەو بەندە چە بێ ڕێگای نەجاتم
نە فەوتینی تەواو ژێن و حەیانم
چبێ ڕێگای نەجاتم لەو ئەسیری
نیشانم دەن بە دڵپاکی بە ژیری
کە تاجر ئەو وەلامەی‌دا، سبوتی
بە خێڵێکی گەلێک زۆر قەومی تووتی
دەگەڵ بیستن هەموو مردن لە جێ خۆ
کە تاجر زۆر ژەبوو لەو وتەی خۆ
ئەگەر تاجر لە بۆ ماڵێ گەڕاوە
پەیام و مردنی تووتی گێڕاوە
دەگەڵ بیستی وەلام تووتی جەوانی
لە پڕ مرد و بڕا هێز و تەکانی

هەچی حـەول و دەواو دەرمـان کـرا بـۆی
بە بی سـودی دەری هێنـا لـە جـێ خـۆی
لـە پـڕ تــووتی فـڕی بـۆ سـەرلخـی دار
تـەواو سـالم گـەلیـک عـاقڵ بـوو، وشـیار
سوپاسـی کـرد لـە ئـەو ماڵـە و لـە تـاجر
گــوتی ئیــستا دەکــەن دیــداری ئــاخر
یــەقــین مــردن لـە بــۆ ژیــنی دوایــی
پێـشەی هـەر عـارف و مـەردی خـودایی
سـە خـاڵ ویـستی یـەقـینی ژینی تۆیـە
بـۆ ڕابــردوو مــەناڵــە غــەم فــیرۆ یــە
زە مـان نـەبـوە لـە سـەیـری هـەڵـگڕاوە
ئــەوەی ڕۆیــی تــەواو مــردو بــڕاوە
لــە داهــاتوش مـەکـە بـیر و خـەیاڵـی
کـە ئێـستا ڕوون نیـە نـەقس و کـەماڵـی
چـەمـەعلومـە لـە پـڕ نابـڕێ سـەری تـۆ
وە یــا مــیری دیارێــک بــێ پلــەی تــۆ
نیە بـەلگـەت لـە سـەر بـوون و نـەبـوونی
پــەژارە و غــەم لـە بـۆی دێنــێ جنــونی

هەوڵ دە ئەو سەعاتە چاکبێ حاڵت
ژیان هەرکاتی حاڵە جەمعیساڵت
بەماڵاوا تەواوی کورد وتاری
لە بۆ ئازادی ژین دەرچوو لە شاری
ئەوە دەرسی منی (تۆراو)ی مەحزوون
کە ملک و سەروەتی زۆرم لە دەست چوون
بەڵام ئاخر ئەوینی دل تەواوە
لە مەیدانی پەڕ و باڵم شکاوە
نیە هێزم لە بۆ دەفعی کول و کۆ
سەرم گێژە لە نێو دەرد و غەمی خۆ

## خەیاڵم هەڵدە سووڕێ

خەیاڵم هەڵدەسووڕێ تیژپەڕ و باڵ
لە هەر دەورێ لە بۆم دێنێ بەری تاڵ
لە نێو باغات و سەوزی هەڵدە سۆڕی
بە بۆن و دیمەنی گول بێمە سەر حاڵ
لە جێ گول درک و داڵی هاتە سەر ڕێ
لە هەر هەنگاو تکەی خوێن دادەنێ خاڵ
دلم ڕۆیی لە شوێن ڕازی دەروونی
عەقل بەو حاڵ و سەیرەی وان گەڕا لاڵ

کـــە شـــوێن رازی دڵ دورە لـــە هێـــزم
بە هـەڵسورِیش نـەبـوو دیـدار و ئـیِسـاڵ
بـەری بـاغی هـەمـوو ئـاواتی (تـۆراو)
خـەزان لـێدا وەری کـەوتـە بـنی چـاڵ
بـەمـەئیوسـی دە کـۆخی غـەم خـزاوە
کـەسـیش نایـە بپرسـی چۆنیـەتی حـاڵ

## وتوویژی قالە و خولە

(قالـە) بـۆ لێـرە کـەوتـوی لـە بـەر تـاو
لـە سـەر بـەرۆکـت دیـارە تکـەی چـاو
لـە سـەر ئـەو خۆڵـە دیـارە گریـاوی
چیـت لـێ قـەڵـماوە دەخـۆڵ خـزاوی
بـە هـۆی نـەخۆشـی سـیمات شـێواوە
یـان بـە رِوداوێـک دڵـت رِەنجـاوە
(خولـە) بـۆ کـزی بینـایی چـاوی
لـە مـن دەپرسـی بـەڵـگەی شـێواوی
مـەگـەر نـابینی پـیر و بـێ هێـزم
لـە نیـۆ مالـێ خـۆ تـەواو جـێ بێـزم
وەک سـەرەتـانی دڵـی جـەوانم
بوومـە دوژمـنی مـاڵ و خێـزانم

جێگام لە سوچێک دیاری کراوە
پێ خەوم کۆنە شڕ و دڕاوە
بۆ چلک و بۆ گەن مێچکم دەبێ قاڵ
دورن لە جێگام هەموو ئەهلی ماڵ
خۆراکم نیە بە پێ ئارەزوو
دەعباش لە جێگام زۆر دەبن وەکو
ئەوەی دەمدەنێ زۆری بەر ماوە
هەر خورا دەزانێ چیم لێ قەڵماوە
(قالە) بۆ ناکەی فکرێکی بۆ خۆ
ڕێگا وەبینی بۆ نەجاتی خۆ
ئێستا لە زۆر شار جێگا بۆ پیران
دەولەت دایناوە بۆ ڕەزای یەزدان
بڕۆ سەرفکە لەوێ ژینی خۆ
خۆت نەجات بدە لە زەلیلی خۆ
(خولە) پێم وایە عەقڵت شێواوە
جێگای سالمەندان پولەو دراوە
جێگای کە سێکە سەرمایە دارە
پولی مانگانەی بە پێ قەرارە
گەر پولم هەبا بۆ لە نیو خۆڵێ
دەکەوتم وەکوو حەیوان لە مۆڵێ

شـــوکر مـــن چـــاکم زۆر پـــیرم دیـــوە
لـــە لاپـــەســـیوێ نیـــوەی ڕزیـــوە
جـــەمعـــی وەرەســـەی دوور و بێگانـــە
تـا دەمـری و دیبـەن لـە بـۆ گـۆڕ خانـە
ئێـستا مـن هـەمـە پـەسـیو و پڒیـو
کـەمتـر لـە هـەمـو بێکـەس و هـەتیـو
(تـۆراو)ی مـەحـزون لـە دونیـای فـانی
تـــەماشـــای دەکـــا پـــەڕی ژیـــانی
هـــەرچـــی بـــەوردی دەیکـــا بـــە شـــانە
بـــەرهـــەمـــی دەردی پـــڕ زام و ژانـــە
یـەزدان عـەفوکـە جـورمی عـەبدی خـۆ
دوور بـــێ لـــە عـــەزاب لـــە دیـــوانی تـــۆ

## لە نێو باغان

لـــە نیـــۆ باغـــان دیلانـــە و پێکـــەنینـــە
دڵـــی غونچـــە دەپـــشکوێنێ یـــەقینـــە
بڵێـسەیدا ئـەویـن بـەو جێژنـە خۆشـە
لـە گـوڵ جـوانتر دیـداری نـازەنینـە
دەگەڵ دڵبەر بـەرابـەر بـێ لـە نێـو گـوڵ
تەمـەن تـازە دەبـێ و خۆشـبەخـتی ژینـە

کـە ئاوێنـەی ئـەویـنم کـرد تـەماشـا
نـەبـوو چـاکتر لـە یـارم لـەو زەمینـە
بـە قوربـانی ویـسالی بـێ هـەمـوو ژیـن
قـەبالـەی نێـو بـەهـەشـتە پـێ ئـەمینـە
ئەگەر (مەم) نەی بوو وەسلی خـاتو زیـن
لە نیو قەسری بەهەشـت وەسـڵی یـەقینـە
لە بۆ یـارت سـەرفکـە گیـان و گـەنجـت
کلیلـەی دەربی کـاخی حـەق ئـەوینـە
ئـەوینـە هـەڵـدە کۆڵـێ نیـو دڵـی کێـو
لـە بـۆ یـەک لـەحـزە دیـداری شـیرینە
(تۆراو) پیر بوو لـە داخـی عیـشقی ناکـام
هـەمـوو کاتـێ دڵـی زام و برینـە

## هەولم دەگەڵ ژین

هەچی حـەولم دەگـەڵ ژینـدا فـیرۆ بـوو
گـەلێـک دارای مالیـشم وەکـۆ بـوو
نـەمـلکم بـوو بـە دەرمـانی دەروونم
نـە دارایـش بـە وەسـڵی یـار گـرۆ بـوو
بە سـاڵ و مانـگ بـە دووی دڵـدا گـەڕاوم
نـەبـو جارێـک دەگـەڵ دڵـبەر وەکـۆ بـوو

ئـەوەی وەعـدەی دەوای زامـی بـەمنـدا
سـەرنجمـدا ڕەگ و ڕیـشەی درۆ بـوو
هیوای خۆشی تەمەن سەرتا سـەری ژیـن
لـە سـەفحـەی واقعـیدا پـڕ کـڵۆ بـوو
دڵـی بـردم گوڵـی مـیری جـەوانی
لە بۆ شـێر و پـڵینگ ڕێگـای مـەکـۆ بـوو
بـەری بـیر و سـەرنجـی ئـەو ڕێگایـە
(تۆراو) دەسـتە و مـلانی کـۆخی خـۆ بـوو

## شیمیایی سەردەشت

### ١٣٦٦/٤/٧ هـ نوسراوە

با لـە سـەر قـەبـرم بنێـژن کێلـە بـەردی تـا شـراو
ئەو وەلامەی مـن بنوسـێ نوسـەرێکـی زۆر بـە نـاو
پێـنج بـەشـەی دونیـات بـداتێ دوژمـنی خـۆرەکـەت
زەهرمارێکە لە شیشەی گـەوهـەرە، مـەی نابـە نـاو
چاو چنۆکە عاشـقە بـۆ ئـاو و خـاک و بـەرهـەمـی
دەی هـەوێ لابـا وجـودت یـا هـەزاران بـەنـدو داو
هەڵدە ڕێژی نیعمەتی، خێڵێک دەکاتـە عـەبـدی خـۆی
چەند بەرابەر هێزی خـۆی تێکـەڵ دە و دەباتـە ڕاو

پێ دەکوژی هاو نژادی بەڵکو دایـک و بـابی خـۆی
مێچکی سۆراوی تەماعە و عەقڵ و هۆشی لـێ رفـاو
چەند سەدە دوژمن کە ئاغایە لە سەر خاک و وەتەن
شەخسی خود خواە و فریوە ئەوگەلەی بۆ خـستەداو
وا (تۆراو) پیر بوو لە داخـی خـائینی قـەومو وەتـەن
چوون دەگەڵ داگیرکەرانە و دڵ لە نەسلی پچکـڕاو
بیر، وەکەن داگیر کەرو هاوکاری چەرخی زیندەگـی
زۆر لـــەوان بـالآتری خـــستۆتە گـــڵ ڕووڕەشــکراو
بەڵگەی ڕووناکە سـەددام تـۆقی لـەعنـەت چـۆملی
سەهمی هەر زالم عەزابە لای خودا تەسـویب کـراو
***

گوڵـــی دڵ وامنـــت هێنایـــە پـــیری
خـەڵاتی تـۆ لـە بـۆ مـن بـۆ ئـە سـیری
دڵـــــت بـــــردم ڕەوانی تێکـــــەڵاوە
شـەهیـدمکـەی نـەپێویـستە بـە شـیری
بـــەڵـــێنت دا وەفــا و عیـــشقت تـــەواوە
بـــەکـــام تـــاوان ڕووناکـــە لـــێم زویـــری
لـــە ئاوێنـــەی دڵـــم ســـیمات تـــەواوە
لە کەسف و خـەسـتی زۆر دوورە مـونیری

لـه لای مـن شاگوڵـی بـاغی ئـەویـنی
مەپۆشـە خـۆت بـە ئاوریـشم و حـەریـری
لـــە قـــانونی ئـــەویـــن لادان گوناهـــە
دیوانـەی عیـشقی تـۆم زانـا و خـەبـیری
بترســـە ئـــاه و ناڵــەی تونــدی عاشــق
دەگاتــە لای خــودای بینـــا و بــەســیری
بـــە دیـــدارێک تیمـــار کـــە زام و دەردم
کــە بــۆ شــیفای پــەرِیــشانی قــەدیــری
مەسووتێنە (تـۆراو) چـەنـد جـار سـووتاوە
بۆ خۆی دەمرێ بە عیـشقی بـێ نـەزیـری

***

ڕوان چیتـــە دەکـــەی زێـــڕە و قریـــوە
ئـەتـۆ ڕیـشەت لـە لاشـەمـدا چـەقیـوە
لـە نیـو پـەردەی نـەبـوونی هاتیـە بـوونم
هـەمـوو هێـزت لـە سـەر مـن دا بـەزیـوە
ئـەگـەر چـاوم لـە دونیـا دی ڕوونـاکی
لەشـم بـۆ تـۆ قـەرار گـاه و پەسـیوە
دەگەڵ هەر لـەحـزەیـەک سـەرفی ژیـانم
بـــەلای زۆری بـــە کۆمـــەڵ تـــێم خزیـــوە

ئـەوێـستا پـێم گـەیـی دەورانی پـیری
ڕەگ و ئێسکم دەگـەڵ گۆشـتی کولـێوە
ژیـــانم بۆتـــە ژار و پـــڕ لـــە ژانـــە
هــەمــوو هێــز و تــەوانم هــەڵــوەریــوە
دە، ریـشەت هـەڵـبڕە دەرچـۆ لـە لاشـەم
مـنی (تـۆراو) لـە ژیـن خۆشـی نـەدیـوە
هـەتـا رەزگـاری بـێ لـەو چاڵـە فیتنـەی
کـە دونیـای نێـوە ژهرێکـی نـەدیـوە
بەرو بـەهـرەی هـەمـو گیانێـک بـەڕوونی
وەری دەگـرێ ئـەمـیرەیـان هـەتیـوە
***

## (وەرگێڕاوە لە مثنوی)

### بەستەی یەکەم

لــە دەورانی پــێش پادشــاهێ بــوو
بــە هێــزتــر پاشــای دەورانی خــۆ بــو
عــادڵتــر نــەبــوو لــە ســەفحــەی زەوی
ســەری ملوکــان لــە بــووی نــەوی
لاملــی نــەبــوو لــە دەورانی خــۆی
خــاوەنی گــەنــج و سامانی بــە کــۆی
بــۆ ســەیر و ســەفــەر درا فــەرمــانی
لــە بــۆ پــرس و جــۆ لــە دێ و شــارانی
شــروع بــو ســەفــەر بــە ئــاواتی دڵ
دەگــەڵ وزرا و پێویــستی مــەنــزڵ
بەخششی گــەیی بــە هــەر موستەمەنــد
تاگــەیــە شــاری جــوانی ســەمــەرقــەنــد
لــە کــاخی بــەرزی مــیری ئــەو شــارە
میــوانی کــرا بــوو چــۆنی لــە بــارە
لە سەیــری کــاخ و گــوڵ و گــوڵزاری
لــە جێــژنی شــادی بــۆ شــەهریــاری
لــە پــڕ کیژیــک کــەوتــە بــەر چــاوی
بــە هــەوڵ نــەزەرپــسا هــەنــاوی

شیری عیشقی کیژ، وای دای لە جەرگی
کردی بە چوار لەت نێزیک بوو مەرگی
هەرچی سەرنجی زیاتر بوو بۆ کیژ
بلێسەی عیشقی زیاتر دەبو تیژ
چاوێ نەی دیبوو جوانتر لە جیهان
بە سیما و دیمەن تا قانەی زەمان
خواستگاری کرد پاشای بەوەفا
زۆر عادلانە بە سوڵح و سەفا
زێڕو گەوهەری بەسەردا ڕژاند
لە بۆ فوقەرا سەدەقەی پرژاند
بۆ خەلوەتخانە کیژی هێناوە
زۆر حەکیمانە دڵ خۆشی داوە
بەلام گوڵێ ڕووی یاری نازداری
زەردی و پەشێوی دەکا دیاری
پا شا لە زەردی ڕوومەتی یاری
ئاوری ئەوینی بڕی قەراری
کەوتە فکر و بیر بۆ دەواو شیفای
لە پۆلی دوکتور لە نوشتە و دوعای
هەرچی پیویستی گەشەو شادییە
لە بە زم و سەیران باغ و نادییە

هەمووی ئامادەی یاری بەڕێزی
لابەرێ زە ردی کزی بێ هێزی
بەرهەمی نەبوو گوڵزار و سەیران
وەک شیفای نەدا دوکتۆر و دەرمان
لە هەرجێ دوکتۆر مەشهور بوو ناوی
دەی هێنا یاری بکاتە داوی
بەڵام هەموویان دوور لە شیفا بوو
پاشا لە تاوان تەواو شێوا بوو
پەنای بردە بەر مزگەوتی خودای
بە گریە و زاری بە زیکر و دۆعای
چۆ خەو لە خەودا گویتان شەهریار
وە لیەک لە غارێ خۆی داوە حاشار
بانگی کە بەڵکو بزانی دەوای
یا خۆ قبول بێ لای خودا دوعای
پاشا حازری کرد زاهیدی غاری
داینا ڕوویەڕووی دیمەنی یاری
زاهید تێی فکری تی گەیی حالی
عیشق ئەوینە ژیانی تاڵێ
عەرزی کرد پاشا چۆل بکەن مالی
لە ڕوودا ناڵێ چونیەنی حالی

زاهیـد ڕووپـەڕی ژیـنی هـەڵـداوە
زاتی ئـەو کیـژە ئـەسـیر کـراوە
پرسـی لـە نێـوی لـە دایـک و بـابی
شـوێنی ژیـانی دۆسـت و ئـەحبـابی
ڕوومـەت و سیمای زەرد هـەڵـگەڕاوە
دیـارە بـە ئـەویـن دڵـت سـووتاوە
نەرمی و حەکیمی و پرسیاری گەرمـی
لای دا لە ڕووی کیژ چار شێوی شەرمـی
گـوتی گـوڵ چیهـرە نیـو و نیـشانم
شـاری سـەر قـەنـد شـوێنی ژیـانم
بـابم ئـەمـیرە لـە سـەر ئـەو شـارە
قـودرەت و هێـزی دوور لـە ئـەژمـارە
بـە باشـتر شـێوە مـنی دا بـە شـوو
چـاکتر نـەی دیـوە عـەسـری ڕابـردوو
بـەلام مـن لێـرە دڵ لـەوێ مـاوە
لـە دڵ و گیـانی گـەنجێ هـالاوە
گیـان و دڵـی ویش لـەوی چەسـپاوە
ئـەو لـە مـن زیـاتر دڵـی سـووتاوە
ئیـستا کـە بـانووی یـەک شـەهریـارم
بـە ئـاوری ئـەویـن پـڕ لـە ئـازارم

زاهیـد لـێ پرسـی نـاوو نیـشانی
مـەحـەلـلی کـاری کۆچـە و کـۆلانی
گـوتی زەرگـەرە مـەشـهور نـاوی
لـە تـەواوی شـار ڕوونـە ناسـراوی
زاهیـد گـوتی یـارت زودینم بـۆ تـۆ
خزمـەتـت بکـا بـە ئـاواتی خـۆ
چـۆ خزمـەت پاشـا گـوتی شـەهریـار
مولـک و دارایـیت دائـیم بـەر قـەرار
یـارت عاشـقە دڵ لـە دەسـت چـووە
زەرگـەرێ دڵـی لـێ ئـەسـتاندووە
تـەنهـا دەرمـانی زەرگـەر هێنانـە
بیکـە خزمـەتکـار لـە بـۆی ڕوژانـە
هـا ئـەو دەرمانـە ژەریکـە تـەواو
هەر کەسێ بیخوا زوو دەچێ لە ناو
هەوەڵ ڕۆژ گۆنای سیس و زەرد دەبێ
دوهـەم بـە دەنی زۆر گـڕوێ دەبی
سێهـەم ڕۆژ لـەرزەی دیتـە ئـەنـدامی
ڕەش دریـوە دەمـری ناکـامی
لـەو مـاوە یـارت دیتـە وە سـەر خـۆ
دڵـی دەپچـڕێ لـەو دڵـبەرەی خـۆ

عیشق و ئەوین دیتەوە بۆ تۆ
ژیان بەر نەسەر بە ئاواتی خۆ
نێوی زەرگەر و مەحەلی کاری
تەواو مەشهورە لە هەموو شاری
پاشا ئەمری کرد وەزیری بە ناو
زەرگەر جەلبکا بە زێڕ و دراو
دەیکەم بە نۆکەر لە بۆ کا بانم
بەڵکوو دووایی بێ تاڵی ژیانم
بەرەو سەمەر قەند وەزیر کەوتە ڕێ
زەرگەری دیبەوە ئاسان لە سەر ڕێی
گوتی بەزەرگەر بەختت هەستاوە
پلەی وەزیری بۆ تۆ دانراوە
گوڵچیهرە سپاردی بە شەهریاری
تۆ نکاتە وەزیر لە نێو دەرباری
ڕۆژ لە خزمەتی گوڵچیهرە دا بی
شەوێ خزنەدار لە خزنەی دا بی
ئەوەش کلیلەی گەنجی شەهریار
سەبت کراوە تەواوی بڕیار
زەرگەر بە عیشقی دیداری یاری
پلەش وەر بگری لە شەهریاری

کەوتە ڕێ دەگەڵ وەزیری کاری
زۆر بە ئاسانی گەینە دەرباری
هەوەڵ قەدەمی جێژنی میهمانی
دەرمانیان دایە بە خۆی نەزانی
بردیانە خزمەت گوڵچیهرەی یاری
زەردی ڕوومەتی کردی دیاری
یاری دڵسوتاو تیێ بڕی چاوی
ڕوومەتی زەردی سیمای ژەکاوی
گوتی شکنجە و ئازار دراوی
یان ماندوی ڕێگای هێندە شێواوی
گوتی ناوە لەلا زۆر بە ئیحتیرام
هێنامیە دەربار بە شادی تەمام
دوهەم ڕۆژ زەڕگەر هاتە لای یاری
گڕوێ و پڕ خارش لەشی زامداری
گوڵچیهرە دیتی یاری بە و حاڵەی
تەواو سارد بووە عیشقی چەند ساڵەی
ڕووی لێ وەرگێڕا و چۆلی کرد مەکۆیی
زەڕگەر مایەوە دەگەڵ غەمی خۆی
سێهەم ڕۆژ زەڕگەر هاتە لای یاری
لەشی لەرزۆک پیس و زامداری

بێـــزی هــەڵـــستا گوڵـــچیهرەی یـــاری
بــە فــەوری گــوتی بــە شــەهریـاری
زەڕگـەری لا بـە لـە کۆشـک سـەرای
تـا ئێمـەش نـەمـرین بـە دەرد و بـەڵای
زەڕگەریان برد وەگۆشێکی ژێـر خـان
هـەر لـەوێ مـردو بردیـان گۆڕسـان
دڵـــی مـــەلـــەکـــەش تـــەواو شـــۆراوە
عیـــشق و ئـــەویـــنی بـــۆ شـــاگەڕاوە
گوڵی ڕووی گەشبوو خەندان و شادان
دەگـەڵ شـەهریـار بـە ئـاوات ژیـان
گـوتی بـە زاهیـد هـاو کـارێکی خـۆی
ئەو کارەی کردت زۆر دوور بوو لە تـۆی
بۆیـە واسـیتەی مـەرگـی جـەوانـێ
لـە بـەرنامـەی دیـن دینـێ زیانـێ
گوتی ئەو گەنجە مورتەد بوو لە عین
کیژیش موسولـما زۆر چاک بـە دیـن
دەبـوو ئـەو عیـشقە زووبچـێ لـە نیـو
تـاڕەوان پاکـێ نـەفـەوتـێ بـە دیـو
ئـەوەی مـن کـردم بـەرنامـەی دینـە
ئـیستائەو کیـژە لـە ژیـن ئـەمینـە

هەر عیشقی ناپاک سەزای فەنایە
ئەوە دەستوری پاکی مەولایە
بۆیە (تۆراو)یش لە تەواوی ژین
لە عیشقی ناپاک خۆی کردوە پەرژین
خۆی پارازتووە لە عیشقی درۆ
ئەوینی حەقی دایە دڵی خۆ
تەبیبی دڵ و گەنجینەی ئەوین
کەسێکە بە حەق زانایە و بە دین
نوری یەزدانی لە دڵ گیر ساوە
گەنجی نەهێنی ڕوون لە بەر چاوە
(خضر) بەسیلێ کوشتی منداڵێ
لە دایک و بابی لا برد زەواڵێ
(ئاسەفی) زانا بە چاوتر و کانێ
تەختی (بلقیسا)ی هێنا دیوانێ
لە پێش (سولەیمان) داینا بە جوانی
ئەوە عیلمی کە فەزلی یەزدانی
ئەوەی نەزانە وەکوو (تۆراو)ە
گیان و دەروونی دائیم شێواوە

## وەک هەمو حێکایەتەکانی مەسنەوی

ئەو حیگایەتە عیرفانی و تەسەووفییە و شەرحی زۆر و تەعریفاتی
زۆری لە سەر کراوە زۆر زانا و بە ڕێز (کەریم زەمانی)یش
شەرحێکی جوانی لە سەر نووسیوە کەلێرە داجیگای نابێ
بە نەزەری من ئەو ڕیواتە باشە کە پاشایەکی ساسانی کە
شاهەنشای زەمانی خۆی بووە لە بۆ سەرکە شی ژێر
دەسەلاتی چۆتە شاری سەرمەرقەند و لە جێژنی میوانی
پاشای ئەو شارە کیژی پاشای دیوە و عاشقی بووە و
خواستگاری کردووە بۆ حەرمسرای خۆی هێناویەتەوەو
ئەو داستانی عیشق و نەخۆشی بێ عیلاجی دەواو دکتورو
پەیدا کردنی زاهید و هێنانی زەرگەر و مردنی بەدەرمان
گەڕانەوەی عیشق و ئەوینی شابانو بۆ شەهریاری و
ژیانی بە ئاواتیانی لێ پەیدا بووە

پێویستە بزانین کە خودی مەولانا نووسیویەتی: پاشا لە ڕاوێ کە
نیزەکی دی و عاشقی بوو، بە مالّی زۆر کڕیویەتی وەک دەفەرمێ:

اتفاقا شاه روزی شد سوار
با خوال خویش از بهر شکار
یک کنیزک دید شد بر شاه راه
شد غلام ان کنیزک جان شاه

مرغ جانش در قفس چون می‌طبید
داد مـــال و ان كـــيتر را خريـــد
چون خريد او را و بر خوردار شد
ان كنيــزك از قـــضا بيمـــار شـــد

هەر وەكوو ڕاگەیەنرا زۆر ئاشكرا بە هەموو كەلامەكانی شێخی مەسنەوی بە سورەتی نەزم و هۆنراوەن و پێویستی كورت كردنە و و كەم هیجای عیبارەتن بەو بۆنە لە جیاتی سەفەری پرس و جۆی وەلات (ڕاو)و لە جیاتی شاەڕێگای كاخ و حەرەم سەرای میری سەمەرقەند (شاەڕێگا)ی نوسیوە بەو ئیعتیبارە ئەو نوسراوە باشترین ڕیوایەتی ئەو چیرۆكەیە دەگەڵ ئەوەش ئەو پاشایە چوو بێتە سەركەشی یان چوو بێتە ڕاو وە ئەو كیژە كچی پاشایێ و خوازرابێ یان كنیزەك بێ و لە شاەراهی كڕیابێ بۆ ئەو داستانە هیچ فەرق و جیاوازی نییە

***تەوەكول و بیر و بڕوای دەرویش سەبیلە***

دەرویشێ گەدا لە شاخی كەشكۆڵ
لە دەرگای (مسجد) دانیشت لە سەر خۆڵ
توند هاواری كرد ئەی خاوەن ماڵە
خێـــراتم دەیـــە ژیـــانم تاڵـــە

زۆرتینو و برسیم کەوتوم لە شوێنم
ڕووت و بێ بەرگم پێم بدە نوێنم
زۆر لێ قەلّماوم بێ ماڵ و بێ جێم
بێ کەس وارس لە شار و لە دێم
لە دەگای هیچ کەس نەکراوم مەحروم
تۆش خێرم دەیە هەتا نەمردوم
دەرویش سەبیلە مەشهورە ناوم
لە ماڵ و سەروەت من دەر کراوم
چەند جار و بەشێوە توندی کردی هاوار
وەلامی نەبوو لە دار و دیوار
یەکێ بانگی کرد دەرویشی نەفام
ئێرە مەزگەوتە، ناگەی بە مەرام
بۆ نوێژ و تاعەت دروست کراوە
خالی لە پول و لە نان و ئاوە
دەرویش گوتی ئە تۆ کەرو نەفامی
کە بۆ من دەکەی درووە نەمامی
ئەگەر مزگەوتە و ماڵی خودایە
ڕزقی بوو نەوەر لە دەست وی دایە

چۆن بێ بەش دەکا منی عەبدی خۆی
بە قین دەمداتی لە نیعمەتی خۆی
لە دەرگای سەخی کەس بێ بەش نەبوو
ئەی خودای سەخیان من پەنام بە توو
لەو سفرەی دەیدەی بە دۆست و دوژمن
لەویش بنێرە تەواو بەشی من
هەر کەسێ بێتە دەرگای یەزدانی
بۆ سفرەی بەرزی دەکرێ میوانی
بەو شێوە دەرۆیش پەرەی دا دوعای
لە نێو گڵ و خۆڵ لە دەرگای خودای
دەگەڵ سکاڵای تەواو بوو ژیانی
ئەهالی دیتیان سیمای نوورانی
کفن و دفن یان کرد بە گوێرەی شیاو
بوو بە زیارەتگای منتەقەی تەواو
(تۆراو) دەنێری بۆ گیانی دۆعای
بە باشتر وەلی قبوول کا خودای

## بستەی دووهەم

بەتیلەی چاو ئیشارەت کرد ژووانە
لە نێو باغ و گوڵ و لالە و ڕیحانە
دڵ و گیانی کز و سیسم گەشاوە
کە ئیشارەت نمەی کاتی بەیانە
پەچەی چین چین و پڕژاوت جوانتر
لە ئەو ئاوریشمە خاوەی سەر، دوکانە
لە جوانی چاوی پڕ تیلەی عەیاریت
خەجاڵەتمان سوهەیلی بەر بەیانە
بە ناز و لار و لەنجەی قامەتی خۆت
دڵت بردم لە دەورەی پاسەوانە
گوڵی ڕووت عەتر پڕ ژانی ئەوینە
نەبوو وێنەی لە نێو چەرخی زەمانە
دوولیمۆی سینەی سیمین سافت
دوڕ و گەوهەر لە دەورەی ئاوێزانە
منی کێشایە قوربانی ئەوینت
کە پیشەی عاشقانی هەر زەمانە
لە دەورەی کاخی تۆ سوڕام بەوردی
لە ئیشارەت نەبوو نێو و نیشانە

بـدە ڕێگـام لـە بـۆ سـیدقی بـەڵـێنت
ویـسالت بـێ لـە گوڵـزاری میرانـە
بکـە دەرمـانی زامـی شـیری ئـەبـرۆت
بـرینی قـەلـبی (تـۆراو) زۆر بـە ژانـە

## بستەی سێهەم

## النَّجاةُ فِی الصِّدیق

ئەو چیرۆکە بەزۆر نیوو عیباراتی جوی جوی لە زۆر کتێبدا نوسراوە

قالـە و خولـە و بلـە هـەڤاڵـی شـیاو
لـە کـار و پیـشە هاوبـەشـبون تـەواو
شـەریـک و دڵـپاک لـە سـود و زیـان
لـە غـەم و شـادی ڕوداوی و ژیـان
بـە دیـن و ئـەمـین دەژیـان بـە شـادی
دوور لـە پـەژارە لـە نـامرادی
ڕۆژێـک پێکـەوە دایاننـا قـەرار
بچنـە کوێـستانێ بـۆ ڕاو و شـکار
کۆیـان کـردە وە پێویـستی بژیـو
بـەشـی چـەنـد ڕۆژێ لـە کـاڵ و کولـیو

و یەکــرا کــەوتنــە ڕێ کــاتی بــەیــانی
بــۆ ســەیــری کویــستان زۆر بــەڕەوانی
چەند ڕۆژ لـە کویستان خـەریکبوون بە ڕاو
نێـو چیریـان زۆر گـرت بـە تـەڵـەو بـە داو
لــە ناکــاو هــەوای کویــستان گــۆڕاوە
بریــسکە و بارانــە و تــەزرە و ســێلاوە
لـە نێـوە ئـەشـکەوتـێ ماڵـیان دانـابوو
بـۆ خـەو و خـواردن زۆر جێگـای چـابو
بــۆ لای ئــەشــکەوت زووگــەرانــەوە
بـۆ خـەو و خـواردن بـۆ حـەسـانەوە
بـە سـێلاو سـەنگـێ هـەڵـقەنـا لـە کێـو
قــورس گــرانی وەکــوو لــەتکـە کێـو
بـەرە و ئـەشـکەوت دەهـات هـەڵـخولاو
گـەیـە ئـەشـکەوت و زالکـی بـەسـت تـەواو
مـەحکـەم و زەلام چـەقـی لـە دەرگـا
لاناچـێ مـەگـەر بـە لـوتفی خـودا
بوونــە زینــدانی لــە نێــو مــەنزڵــگا
کـەوتنـە فکـر و بـیر بـۆ چـارەی ڕێگـا

قالـــە گـــوتی ئـــەوە تۆفانـــە و نـــووحی
زۆر بکـــەن دوعـــا و تۆبـــەی نـــسووحی
هـــەر کـــەس کردویـــە لـــە تـــەواوی ژیـــن
کـــاریکی خێـــری بـــۆ یـــەزدان یـــەقـــین
دور بـــێ لـــە ریـــا و لـــە خـــود نومـــایی
مـــەحـــزی ســـەدەقـــە و ڕەزای خـــودایی
وە بـــیر خـــۆ بێـــنن و پـــێ بکـــەن دوعـــای
بـــەڵـــکو قبـــوڵ بـــێ بـــە لـــوتفی خـــودای

## (وتاری بلە)

(بلـە) گـوتی ئـەمـن لـە تـەواوی ژیـن
کـچ مـامێکم بـوو جـوان و نـازەنـین
لـە نیـۆ مـەنتقـە وەکـوو چـرا بـوو
دڵـی زۆر لاوی لـەمـل هـالا بـوو
بـەلام ئـەویـنی پـاک و بـێ ریـای
لـە مـن هـالا بـو بـە مـن بـوو شـیفای
منـیش بـە عیـشقی شـەیدا بـووم تـەواو
دڵـی هـەردووکمـان بـۆ یـەکتـر کـولا و

زۆر جـار لـە مـام کـرا داو خـوازی
کچەکەی نەدامێ خوای لێ بی ڕازی
ڕۆژێک مەحەللە خەڵوەت کرا بوو
مـن و ئـاموزام لـەو نێـوە مـابوو
ئـامۆزام هـات و زینـەت کرابـوو
ڕاکـشا لـە پێـشم تکـای زینـا بـوو
منـیش ئامـادە چوومـە نێـو ڕانی
فـەوری پـێم گـەیـی بـیری یـەزدانی
هـەستامە سـەر پـێ بـۆ ڕەزای یـەزدان
نـەمکـرد بـە تکـای ئـامۆزای جـوان
خـۆم و ئـامۆزام تـەرکـی ئـارەزوو
یـەزدان گـەرکـرا خـالیس لـە بـۆ تـۆ
دەرگـان لـێ وەکـەتۆ بـە لـوتفی خـۆ
لا بـە لـە دڵـن غـە م و کـول کـۆ
ئەو سنگە کە مێک لا چوو لە درگای
بـاقی مایـەوە مـەحکـەم لـە جێگـای

## (وتاری خلە)

(خلە) گوتی چەندێ لە سالانی پێش
دایکێکم هەبوو زۆر پیر و پڕ ئێش
تەنها ئەمن بووم واریس و ئەولاد
بۆ خزمەتکاری بۆ بەرگ و زەواد
گوتی (خلۆکە) بۆم بێنە شیری
لە ئاوە دانیش نەبوو دەست گیری
ناچار بە پەلە هەلاتم بۆ شار
کولێ نێک شیرم بۆ کڕی لە بازار
هەتا هاتمەوە بوو بە ئێوارە
دایکم خەو تبوو چۆنی لە بارە
شیر لە سەر دەستم وەستام لە بانی
وەخەبەر نەهات تاکوو بەیانی
خەبەری بۆوە دەگەڵ زەردەی تاو
ئاوم بۆ هێنا شوشتم دەست و چاو
شیرم بۆ تێکرد بە میهرەبانی
سی لیوانی پڕ خواردی بە نانی
یەزدان ئەو کارەم ئەگەر کرد بۆ تۆ
دەرگان لێ وەکە تۆ بە لوتفی خۆ

دیسان کراوە کەمێک تر دەرگای
بەلام بۆ ئینسان نەدەبۆ ڕێگای

*(وتاری قالە)*

(قالە) گوتی سالێک بۆ کار چومە شار
لە نیو کارگایەک بۆیاندام بریار
کاری ڕۆژانە و زۆر بوو دراوی
پێویستی ژینی لێ بوو تەواوی
ماوەیەکی زۆر کردم ئەو کارە
وە سەریەکم نا زۆر پول و پارە
کیسەکەم پڕ بوو گەڕامە وە مال
ڕێگام کەوتە نێو کوچێکی بەتال
لە خانویکی کۆن گریە بوو هاوار
لە ژن و مندال گەرم و پڕ ئازار
دلم گەرم بوو ڕژا ئەسرینم
چوومە بەر دەرگای تەواو ببیم
دیتم ئەو مالە دەرگای شکاوە
ژن و چەند مندال دەوی خزاوە

پرسیم ئەو ماڵە بۆ وا شێواوە

دەر و دیواری وا تێک ڕووخاوە

ژن دەگەڵ گریە وەڵامی داوە

فەقر و بێ کەسی لەمە ڕوی داوە

ئەمن بیوەم ئەوانەش هەتیو

بێ جل و بەرگ و بێ خەو و بژیو

ئاگری تێ بەربوو و جەرگو هەناوم

لەو تاڵ و ژینە دیتم بە چاوم

گوتم بە یەزدان ئەو پول و پارە

مەحزی ڕەزای تۆ دەیدەم بەو ماڵە

سپاردم بەو ژنە کیسەی پڕ لە پول

تاکوو لای یەزدان باش بکرێ قبول

دەڕوم هەڵنەهات بە چمەوە نیو ماڵ

لای ژن و منداڵ بە دەستی بە تاڵ

دیسان بۆ کار زوو گەمەوە

دەستم بە کارکرد چەند ڕۆژ مامەوە

پولم پەیدا کرد هاتمەوە بۆ ماڵ

بە دەست و دیاری بۆ ژن و منداڵ

یـەزدان ئـەو کـارەم ئـەگـەر بـۆ تۆیـە
دەرگـان لـێ وەکـە کلیلـەی بـە تۆیـە
لـە پـڕ ئـەو سـەنگـە هـەڵـقەنا لـە جـێ
بـە هـەڵـخولاوی دەڕۆیـی لـە ڕێ
نەوەسـتا هـەتـا گـەیـە دەرەی کێـو
دەرگـاش کـراورە لـە ڕاوچـی پـەشـێو
گـەڕانـە بـۆ مـاڵ بـە کۆڵێـک نیـو چـیر
بـێ بـەش مایـەوە (تـۆراو)ی فـەقـیر

## بستەی چوارەم

سـەیـرە کـە پـیری زیـاد دەکـا ئـەویـن
زۆرتـر لـە گـەنجـی ڕووناکـە و یـەقـین
کیـژێ دەبیـنم جـوان ڕازاوە
دڵ لێـی دەهاڵـێ وەک مـێش لـە هـەنگـوین
دڵـم دەکێـشی کـەمـەنـدی زولفـی
گـیرانم بـە پـەچـەی ئاوریـشمی چـین چـین
وەکـوو سـەنعـانی و کیـژی مەجووسـی
عیـشقی زۆر گـۆڕی لێـی ژیـان و دیـن

مــن لــە ســەنعــانی زۆرتــر شــێواوم
دڵــی بژانــدوم ئــەوینێــک بــە تــین
تکــام دیــدار و ویــساڵە بــە وی
وەڵامــی بــۆ مــن خەنــدەو پێکــەنــین
دەڵــی وەگــەڕێ دەوری جــەوانی
دێمــە بــاوەشــت باشــتر هــاو ســەریــن
تــەمــەنی پــیری بێتــە وە، لاوی
هــەر نــەخولقــاوە مــەحاڵــە ژیــن
بــەهانــەی دڵــبەر لــە (تــۆراو)ی و پــیر
ڕێگــای ئــاواتی لــێ دەکــا پــەر ژیــن

## بەستەی پێنجەم

(یا رسول الله) • لە سەر دەستم ئەوا قورئـانی تـۆ
ئەو خەلاتەی پێی کەرەم کردی بە حەق یەزدان بـە تـۆ
من ئیمان و بـاوەڕم پێـی مـەحکـەم و سـەبتی دڵـم
تێکـەڵاوی خـوێنی لـەشمـە بێ ڕیـا ئیخلاسـی تـۆ
وەی ئەسەف زۆربەی هەڵەم کەوتۆتە نێو پەڕتووکی ژیـن
وەک کەم و کەسریم لە ڕێگای پەیڕەوی فەرمـانی تـۆ

دەفتەری ژینم ئەوا پڕ بۆتەوەزۆربەی خەتان
هەر پەڕەی چەند نوقتەی ڕەش وا لە ویدا بوون وەکۆ
زۆر دەمێکە هەولمەبۆم هەلکەوێ ویستی سەفەر
بێم زیارەت کەم دەری ئەو ڕەوزەی ریزوانی تۆ
من کە شەرمەندەی تکای عەفوی هەلەو تاوانی خۆم
تۆشەفاعەتکەی بە ڕوحمت بۆم لە لای یەزدانی خۆ
بێ بەشی فەیزی حوزورم یا شەفیع پێم دەئەمان
هەرچیهەم لەو ئوممەتەم گەر نیسبەتی خاسە بە تۆ
تۆتکای بەخشش بکە بۆم تا نەکەومە نێو جەحیم
پێم نەگا تۆلەو سەزایی کاتێ دەکرێ پرس و جۆ
ئەو دەمەی مندالی ساوا پیر دەبێ و موی بە فرییە
تا نەبێ (تۆراو)ی موجریم ڕوو ڕەشی دیوانی تۆ

## بەستەی شەشەم

ئەرێ چەبکەم لە بۆ دیداری ڕەهبەر
لە سەر گیانی هەموو پاکانە سەروەر
لە فەزلی وەی خەلق بۆ خاک و ئاوی
درا نووری بەڕۆژ و مانگ و ئەختەر
لە بۆنی گول لە سەر سفرەی زەمینی
لە کێو و دەشت و باغی بوو موعەتتەر

لـە بـۆ سـەجـدەی بـەرابـەر قامـەتی وی

خـەلـق بـوون سـەرو کـاج شمـشادو عـەرعـەر

لــە پــیرۆزی خــەلاتی شــافیعی وی

بــە پۆلــێ دار و ســەوزی بــەخــشرا بــەر

لــە بــۆ دیــداری پیوســتە وەســیلە

ئـەویـش کوشـتەی هـەوای شـەیتـانی ئـەبتـەر

ئـەویـنی خالیـسی چـەسپا لـە هـەرکـەس

دڵ و گیــانی دەبــێ شــاد و مونــەوور

پەنـا ئـەی خـەزنـەداری گـەنجی رەحـمەت

بــە دیــداریک بکــە قــەلــبم موســەووەر

چـە (تـۆراو)ێ لـە تـاو بـاری حـوزورت

دڵ و گیــانی لــە غــەم دایــە ســەراســەر

## (نزای عطوفی)

وەدی هێنـــەری هـــەمـــو بنـــەوەر

بژیـــــوی دەری گـــشتی جانــــــەوەر

ئـەتـۆیی هێـزدەری جـولان و تـەکـان

یـەک بـو هـەزاری یـەکـێ بـۆ سـەروەر

بزوێنـــەری، بـای یـەک گیيـانی گـولان

یـەک پـەڕەی کێـوی ئـەرزە سـەراسـەر

جـوانی دەبـەخـشی بـە نـەو نـەمامـێ

ڕوگـــەی دلانـــە وەک (بـــت) و ســـووره

لـە کـافر چاوگـەی دیـن وەدەر دێـنی

لـــە ڕەشـــایی شـــەو ڕۆژ دێنیتـــە دەر

میرێـک دەگێـڕی بـــە گــەدای دییـــار

لـە پیـر هـەتیوێـک دەکـەی بـە ئـەکبـەر

کـــە فـــەرمانـــت دا بـــە دایکـــی پیـــوار

دەشـوا کـەژ و گـل سـەنگـین و بـاوەر

لـە شـوێنێ چـەقـل و درک بـەردێـنی

لـە شـوێنێ لالـە و سوسـنەو سـنەوبـەر

دەسـپێری گـلمەت فـەروی تـەلایـە

بـلقی کـەفی ئـاو، دوڕ دێـت و گـەوهـەر

کێـو پـەڕی کایـە لـە ڕوی جـەماڵـت
سـوتاو بـە سـورمە درایـە بـەسـەر
یوسـف دیمـەنـێ هـەڵـدەتـۆقینی
پێـی دەبـڕژێنی هـەزاران جگـەر
بڵێـسەی ئـەویـن دەخـەیـە دلان
هـەریـەک جـەماڵـێ دەکـا موخـەیێـەر
هـەرچـی بێنێـری بـەرگـری نایـە
بـە هێـزی گـشتی ئـەمـیرو بـە گلـەر
فـەرمانـت هێنـدە بـەرزو بـە هێـزە
بـۆ بـون و نـەبـون فـەوری مـسوگەر
بـە فـەیـزی هـەمـو وەدی هێنـراوت
ئـەوەی پـیروزە و بـە حـەق بـو، داوەر
یاسـای تـۆیی پڕژانـد لـە پـشتی زەوی
لـە باختـەر هـەتـا گـەیـشتە خـاوەر
دەگـەڵ سـیفات و ئـەسمـای پـیرۆزت
نـەهێـنن یـا خـۆ ڕون و مونـەووەر
شـیفای بـەخشـشت بکـە خـەلاتم
چ نیمـە چاکـەی شـەمێلـە و شـەوەر

دیلـــی تـــاوان و هـــەلـــەی ژییـــانم
تاریکـــە دلـــم بـــە جـــەفـــا و جـــووەر
غـەیـری تـۆ نیمـە هـیچ پـەنـاو پـەسـیو
قـــەلـــبم (تـــۆراو)ە لـــە بـــاغ و ســـەمـــەر
لـــە بـــەلای ژییـــان بـــدە نـــەجـــاتم
تـــەنهـــا بـــە تۆمـــە ئومیـــد و بـــاوەڕ
لـــەڕێـــی تۆناســـی هـــەڵـــم مـــەدێـــره
مـــەمخـــە داوێـــنی شـــەیتـــانی بـــەدفـــەر
کـــەمتـــرین عـــەبـــدە (عـــەتـــوفی) پـــەشـــێو
بـــە عـــەتـــری، عـــەفـــو، بیکـــە موعـــەتـــەر

سەردەشت ١٣٧٦/١١/١٤

عطوفی

سورەتی الرّعد ئایەتـی / ۲۰ الی ۲۴) واتـە: ئـە وانـەی ئـەو

تۆکه وەفا دەکەن و و پێکوینن بـەڵـین و پـەیمـانی خـوا =

هەڵنا وەشێننەوە بەڵێن و پـەیمانێـک کـە بـەستویانە ئـەوانـە

خانوی ئاخیرەت (بەهەشت) بۆیان دیاری کراوە جا ئەگـەر

وەفا بە بەڵێن و پەیمان دەگەڵ وەدی هێنەر (یەزدانی مەزن)

هـۆی چوونـە بـەهـەشـتبی دەگـەڵ بونـەوەرەکـانیش ئـەو

خەڵاتەی هەر هەیە چوونکە پـەیمـان شـکێنی و وەعـدە بـە

خیلافی تاوانێکی گەورەیە لە قانونی دیندا بـراو خوشـکانی

بەڕێز هەتا ئێرە لە هەمو بوارەکانی پێویستی ژیاندا لە هـەر

بەشەی دەنکێک لە خەڵواریک نیشانم داوە وە یەقین بزانن

هەر دەنکە لە هەر بەشێکدا کە وە بەرچاو دراوە دەنکێکە لە

خەڵواریک لە ئایـات و حـەدیـث و فـەرمـودەی زانیـارانی

دینی، بە هێوای ئەوە کـە لـەو دەنکـە وە بـڕۆن و بگـەن بـە

خەڵوارەکە و بە پشکێنی خەڵوارەکە بە ڕاستەقینە بگەنە ئـەو

حەقیقەتەکە تەنها قانونێک کە ئاسایش و بەختەوەری و ڕێز و سەربەرزی دنیا و پەسلانی تێدا بێت (قانونی دینە) وە هەر ئەو قانونی دین بەرنامەی ژیان بۆ هەموو بوونەوەرێک و لە هەمو زەمانێکدا دیاری کردووە کە (خالیق و مالیک و حاکم)ی هەموو بوونەوەریک (یەزدانی مەزن) ئەو قانونەی بۆ هەمو بونەوەرەکانی خۆی داناوە کە لە سەرەتای ژین هەتا بڕانەوەی ژین وەری بگرن پەیڕەوی لێ بکە جا هیوام وایە ئەیۆەش کەڵکی لێ وەر بگرن.

ئیتر بە خوواو دسپێرم = درود و سەلاوی شیاو لە سەر

پێغەمبەر و پەیرەوانی بە ماوەی بوون و ژیان

١٣٧٦/٢/١٤ شمسی ٢٦ ذی‌حجەی هجری ١٤١٧

رسول عطوفی